# پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله رب العالمين، الذى أنزل الكتاب بالحق المبين، وأرشد عباده إلى ما فيه نجاتهم يوم الدين، وأرسل الرسول مبشرا ونذيرا للأمة أجمعين، فأحيا به ملة الحنيف إبراهيم، وأذل به الشرك والمشركين، أما بعد:

سوپاس و ستایشی الله تعالى دەکەم کە یارمەتیدام و بۆی ئاسان کردم کە هەڵسم بە وەرگێڕانی یەکێك لە کتێبە زێڕینەکانی زانایانی بانگەوازی نەجد - رحمهم الله - کە ئەویش بریتیە لەکتێبی ( سبيل النجاة والفكاك من موالاة المرتدين والأتراك )، کە بەڕاستی کتێبەکە سەرەڕای کورتی و پوختیەکەی بەڵام یەکێکە لەو کتێبانەی کە لەم سەردەمەدا کەلێنێکی گەورە پڕدەکاتەوە لەبابەتی تەوحید { بەتەنها پەرستنی الله }، شێخ حەمەد کوڕی عەتیق ( رحمه الله ) ئەم کتێبەی لەکاتی هێرش و هەڵمەتەکانی دەوڵەتی موشریکی عوسمانیەکان نووسیوە کە ببونە سەرچاوەی بڵاوکردنەوەی شیرك و سۆفیگەری و گۆڕپەرستی لەو وڵاتانەی کە پێشتر پێیە پاکەکانی فاتیحەکان کەوتۆتە سەری و بە شەریعەتی ئیسلام حوکم دەکرا، هەروەها بوونە هۆکاری ئەوەی کە خەڵکێکی زۆر پێیانەوە هەڵبخەڵەتێت و توشی جۆرەها شیرك و کوفری ئاشکرا بن لە دۆستایەتی کردنیان و یارمەتیدانیان و گوێڕایەڵی کردنیان، هەروەها شەڕکردنیان لەدژی ئەهلی تەوحید، بەڵام الله تعالى هەرگیز لە پەیمانەکانی خۆی پاشگەز نابێتەوە و هەموو سەردەمێك لەم ئوممەتە کۆمەڵێك لەسەر ڕێبازی حەق و تەوحید دەژیێنێتەوە کە هەڵسن بە ژیاندنەوەی میللەتی ئیبراهیم علیه السلام و بانگەوازکردنی خەڵك و بەئاگاهێنانەوەی غافڵەکان و ئیقامە حوججە کردنیان، یەکێکیش لەو سەردەمانەی کە شیرك و کوفر تیایدا زاڵ و بەربڵاو و تەشەنەکردوو بوو سەردەمی دەسەڵاتداری عوسمانیەکان بوو کە تیایدا خەڵکی بەئاشکرا گۆڕ و مەزار و دارو بەردیان کردبوو بە پەروەردگار و پەرستراوی خۆیان..

**لەوساتەدا لە جەزیرەی عەرەبی و لەخاکی نەجد ڕووناکی ئەم بانگەوازە سەرهەڵدەدات و دەبێتە مایەی ڕۆشن بوونەوەی ئەو خاکە و بڵاو بوونەوەی بانگەوازەکە بە گشت لایەکی ئەم دونیایە کە ئێستاشی لەگەڵدابێت ئەوان فەزڵ و چاکەیەکی زۆریان بەسەر موسڵماناندا هەیە و عەقیدەی ئەوان بۆتە هۆکار و سەرچاوەیەکی هەرە گرنگی گەڕانەوەی خەڵك بۆ تەوحید دوای هیدایەت و تەوفیقی الله، لە الله تعالى داواکارین پاداشتیان بداتەوە و لێیان خۆشبێت.**

**سەبارەت بە مەنهەج و بابەتەکانی ئەم کتێبە:**

**باس لە ترسناکی و حوکمی دۆستایەتی کافران و موشریکان دەکات بە ڕوونی، هەروەها باس لەو هۆکارانەش دەکات کە دەبنە هۆی کردنەوەی دەرگا بەڕووی ئەم ترسناکییە.**

**هەروەها باس لەهەندێ هەڵوەشێنەرەوەی ئەم دینە دەکات لە بەهۆیەوە خاوەنەکەی لەدینی ئیسلام دەچێتە دەرەوە کە دەتوانم بڵێم خەریکە خەڵکی بە پڕاوپڕی لەم سەردەمەدا خۆیان بەو هەڵوەشینەرەوانە هەڵواسیوە تەنانەت شانازیشی پێوە دەکەن..والله المستعان**

**هەروەها باس لەهەندێ لەو حاڵەتانە دەکات کە موسڵمان تیایدا عوزری هەیە گەر گوێڕایەڵی موشریکان بکات یەخود بە ڕووکەش ڕازیان بکات.**

**هەروەها باس لە مەسەلەی ئاشکراکردنی دین دەکات و وەڵامی زۆرێك لەو گومانانە دەداتەوە کە دەرخستنی دینیان بەستۆتەوە بە نوێژ و ئەرکانەکان بەتەنها.**

**هەروەها باس لەهەندێ مەسەلەی تر دەکات و چەندین هەڵەی تێدا ڕاست دەکاتەوە بە فەزڵی الله وەکو مەسەلەی لاوازکردن(الاستضعاف) و مەسەلەی هیجرەتکردن، هەروەها سەفەرکردن بۆ وڵاتانی کافران.**

**کتێبێکی لەم شێوەیەش بەڕای من وا پێویست دەکات هیچ کەسێك لێی بێبەش نەبێت کە داواکاری حەق بێت و بەدوای ڕاستیدا بگەڕێت، بەتایبەت کە باس لەهەندێ مەسەلە دەکات کە زۆرینەی خەڵکی لەم سەردەمە تێی کەوتوون لە چەکداری کردن بۆ ئەم حکومەتە کوفرییانە و یارمەتیدانیان لە کاروبار و بەڕێوەبردنی حکومەت و هەروەها دۆستایەتی کردنی کافران و وەرگرتنی یارمەتی لێیان، هەروەها وەڵامی گومانێکی زۆر گرنگیش دەداتەوە کە هەرچی پیشمەرگە و ئاسایش و پۆلیسی مورتەد و کافر هەیە لەم کوردستانە بەهانەی پێ دەگرێت گوایە بۆ پارەی خۆم ئەو کارە دەکەم، ڕوونی کردۆتەوە کە ئەمە نەك بیانوو نیە بەڵکو هەڵبژاردنی دونیایە بەسەر دین.**

**وە لەبەر ئەوەی کتێبەکە بەم ناوە ناوبانگێکی زۆری هەیە و بەربڵاوە، بۆیە وا بەباشم زانی ناوی کوردی بۆ دانەنێم بەڵکو بەناوی خۆیەوە بڵاوی بکەمەوە لەگەڵ ئاماژەدان بەوەی کە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی**

**لە الله تعالی داواکارین ڕۆژێك لەڕۆژان لەژێر سایەی حوکمی ئیسلام ئەم کتێبە بەچاپ بگەیەندرێت و ئەو خەونەی کە لەدڵی تەواوی موەحیدان هەیە بیهێنێتە دی و دڵمان ئاو بخواتەوە بە لەناوچوونی دوژمنانی ئەم دینە و ئازادبوونی زیندانیەکانمان و بەرز بوونەوەی ئاڵای لا إله إلا الله لەسەر خاکی ئەم کوردستانە.**

**هەروەها لێی داوا دەکەم کە ئەم کارەم بە نیەتێکی پاك و بە موخلصی تەنها بۆ ئەو بووبێت و پارێزراو بم لەڕیاو ویستی ناوبانگ... اللهم آمین**

**(ئاری عبد الرحمن)** ٨ – ٨ - ٢٠١٩

## پێشەکی [ کتێبخانەی هیممە ]

**الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه، أما بعد:**

**ئەو کتێبەی کە لەنێو دەستمانە (سبيل النجاة والفكاك من موالاة المرتدين والأتراك) دانراوی شێخ حەمەد بن عەتیق رحمه الله"[1]"، بریتیە لە کتێبی حەوتەم لە زنجیرەی (پەیامەکانی تەوحیدی پاك "رسائل التوحيد الخالص") لە دانراوی پێشەوایانی بانگەوازی نەجدی و جگە لەوانیش، کە کتێبخانەی هیممە شکۆمەند بوو بە لێکۆڵینەوە(تحقيق) و لەچاپدان و بڵاوکردنەوەی کتێبەکان، کە سێیەم پەیامە باسی بیروباوەڕی (دۆستایەتی و دوژمنایەتی "الولاء والبراء") لەخۆدەگرێت دوای پەیامی یەکەم ( الدلائل في حكم موالاة أهل الإشراك "بەڵگەکان لەسەر حوکمی دۆستایەتی کردنی ئەهلی شیرك و هاوەڵپەیداکەران") وە پەیامی دووەم (أوثق عرى الإيمان "توندوتۆڵترین هۆکاری ئیمان بۆ ڕزگاربوون) دانراوی شێخ سلیمان کوڕی عبدالله کوڕی عبدالوهاب رحمه الله.**

**لە الله تعالی داواکارین کە ئەمەی بڵاوی دەکەینەوە بە نیەتێکی پاك و بێگەرد بێت بۆ ڕووی شکۆمەندی الله، وە داواکارین موسڵمانان لێی سودمەند بن، لەڕۆژێکدا کە هیچ ماڵ و نەوەیەك سود ناگەیەنێت جگە لەو کەسە نەبێت کە بە دڵێکی سەلامەت گەڕواتەوە لای الله.**

**کتێبخانەی هیممە**
**دەوڵەتی ئیسلامی**
**مانگی شەوال ساڵی 1437 ـی کۆچی**

---

"[1]" شێخی عەللامە ناوی حەمەد کوڕی عەلی کوڕی عەتیق ـی نەجدییە، لەساڵی 1227 ـی کۆچی لە شارۆچکەی (زولفی) لەدایکبووە کە ئێستا دەکەوێتە باکووری شاری ڕیاز لە بانی نەجد لەخاکی دوورگەی عەرەبی، وە لەساڵی 1301 ـی کۆچی وەفاتی کردووە (الله تعالی ڕەحمی پێبکات و لە بەهەشتە دڵگیرەکەی نیشتەجێی بکات).

## پێشەکی نووسەر

# بسم الله الرحمن الرحیم

**هەر پشت بە الله دەبەستین و ئێمە هیچ هێز و توانایەکمان نیە تەنها لەلایەن الله ـی گەورەو بەرز و بڵندەوە نەبێت**

**سوپاس و ستایش بۆ الله کە کتێبەکە[قورئان]ـی دابەزاندە سەر بەندەکەی(محمد) کە ڕاست ودروستە و هیچ کەلێن و ناتەواویەکی تێدانیە، وە کردوویەتی بە پارێزەر بۆ ئەو کەسەی دەستی پێوە دەگرێت و پشتی پێ دەستێت لە بەڵگەهێنانەوە، وە تیایدا خۆدوورخستنەوە لە ئەهلی شیرکی واجبکردووە بە ڕوونکردنەوەی شەریعەت و مەنهەج، وە صەلات و سەلامی الله لەسەر محمد بێت کە الله تعالی بەو ڕووناکاییەی پێی بەخشیبوو تاریکایی شیرکی هەڵدڕی و پارچە پارچەی کرد، وە [صەلات و سەلام] لەسەر هاوەڵان و شوێنکەوتووانی بێت کە جیهادیان لەدژی ئەهلی کوفر کردووە و لێکیان جیاکردوونەتەوە بەبێ ئەوەی تێکەڵاوی غەیری خۆیان بکەن، لەپاشان:**

**من بەڕاستی قسەم کردووە و بەتوندی جەختم کردۆتەوە لەسەر قەدەغەکردن و نەهیکردن لەدۆستایەتی کردنی موشریکان، وە بانگەوازی ئەو موسڵمانانەی دەوروبەری خۆمم کردووە بۆ دژایەتیکردنی کافران، پاشان لەم بارەوەیە هەندێ ئایەتم نووسی کە بەڵگەن لەسەر ئەو شتە لەگەڵ هەندێ وتەی کەمی لێکۆڵەران لە ئەهلی زانست و ئەهلی دین.**

**وە منیش وا گومانم نەدەبرد کە هەرکەسێ قورئان بخوێنێتەوە و باوەڕ بێنێت بەوەی کە قورئان کەلام و وتەی الله ـیە و الله تعالی ئێمەی کردووە بە بەندە بۆ ئەوەی کردەوەی پێ بکەین و پێی هەڵسین، ئیللا کە گوێی لێبوو شوێنی دەکەوێت و ملکەچ دەبێت، وە دەڕوات بەرەو گوێڕایەڵی کردن بۆ حوکمی الله، ئەمەش بە بەڵگەی وتەی الله تعالی: {اتَّبِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ} [الأعراف : 3]**

واتە: (خەڵکینە) شوێنی ئەو (بەرنامەیە) بکەون کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان هێنراوەتە خوارەوە، جگە لەو زاتە شوێنی هیچ پشتیوان و خۆشەویستێکی تر مەکەون، کەم یادەوەری و پەند وەردەگرن و بیردەکەنەوە!

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا} [النساء : 65]

واتە: نەخێر [ئەی محمد] سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەک دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووە و دەبێت بەتەواویی تەسلیم بن و ڕازیی بن.

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ (123) وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ (124) قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا (125) قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ الْيَوْمَ تُنسَىٰ} [طه : 123-126]

واتە: (ئەوسا الله تعالی فەرمانیدا) فەرمووی: ئیتر هەردووکتان لە بەهەشت دابەزن بەگشتی، هەندێکتان دەبنە دوژمنی هەندێکتان، جا ئەگەر هیدایەت و ڕێنموویی من بۆ ئێوە هات، ئەوەی شوێنی بەرنامەکەم بکەوێت، نەگومڕا دەبێت، نە ناخۆشی و ناڕەحەتی و ناسۆر دێتە ڕێی.

ئەوەیش ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من پشتی تێ بکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین..

ئەو جۆرە کەسە دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ بەکوێری حەشرت کردم خۆ من کاتی خۆی چاوساغ و بینا بووم.

**(له وەڵامدا الله تعالى) دەفەرموێت: تۆ ئا بەو شێوەیە بوویت (کوێر بوویت له ئاستی) ئایەت و بەڵگەکانی ئێمەدا کاتێک پێت ڕادەگەیەنرا، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا مامەڵەی کەسێکی لەبیر کراوت لەگەڵدا دەکەین (له سزاو ئازاردا دەهێڵرێیتەوە).**

**بەڵام هەندێك كەسی نەزان و مكوڕ(معاند) پەیدابوون ئینكاری لەوە دەكەن، وە ئینكاریان كرد لەوەی كە الله تعالى واجبی كردووە كە پێی هەڵسن و ئیقرار(باوەڕپێبوون)ـیان هەبێت پێی، جا وای لێهات ئەوانەی كە خۆیان داوەتە پاڵ زانست و ئەوانەش كە وایدادەنێن كە داواكاری زانستن لەم شتەدا بوونەتە چەند بەشێك:**

**دەستەیەك لەوان: ڕەتكردنەوەی جاهیلیەتی گومڕایی بە باش دانا و پێی ڕازی بوو، وە ئەگەرچی بە ئاشكرا وانەڵێت بەڵام لە ڕووكەشدا ڕوون و ئاشكرایە.**

**وە دەستەیەكی تر: ڕقیان لە ڕەتكردنەوە بوو وە لایەنی ڕەتكەرەوەیان بە جاهیل و نەزان دانا، بەڵام هەڵنەستان بە ئەنجامدانی ئەو شتەی كە الله تعالى واجبی كردووە لە بەرهەڵستیكردنی ئەم شتە و ئینكاریكردن لە ئەنجامدەرانی، وە ئەگەر ئەو شتەش لەواندا ڕووی نەدابایە ئەوا كەسی ڕەتكەرەوە یەكسان نەدەبوو لەگەڵ ئەو كەسەی كە وەڵامی دەداتەوە.**

**جا لەپێناو ئەمەدا شێخەكەمان عبدالرحمن كوڕی حەسەن پەیامێكی بەسودی نووسی بۆ وەڵامدانەوە و ڕەد دانەوەی ئەم ڕەتكەرەوەیە، تیایدا وتەكانی ئەوانی هەڵوەشاندۆتەوە بە هەڵوەشاندنەوەیەكی چاك و بەپێز، وە ئەو پەیامەش بەسە بۆ وەڵامدانەوە و ڕەتدانەوەی، لەئەنجامدا شێخمان بوو بە پێشەوای وەڵامدەرەوە و ڕەد دەرەوەی وتەكانی ئەهلی باطل(ناحەق)، كە ئینكاری لێدەكەن، وە بێگومان الله تعالى سەرخەری دینەكەی خۆیەتی و دینەكەی زاڵ دەكات بەسەر هەموو دینەكانی تر ئەگەرچی كافرانیش ڕقیان هەڵسێت و پێی سەغڵەت بن.**

**پاشان منیش - إن شاء الله تعالى - هەندێ وتە دەنووسم، تیایدا ڕوونكردنەوە هەیە بۆ هەندێ لە هەڵەكان كە ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلامەوە كەوتوونەتە ناو ئەو هەڵانە، بەڵكو زۆرێكیش لەوانەی كە خۆیان داوەتە پاڵ عیلم و زانست !، ئەمەش بە بەڵگەی فەرموودەی الله تعالى: {إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ ۙ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ} [البقرة : 159]**

**واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە بەرنامە و ڕێنموویییەکانی ئاشکرای ڕەوانە کراوی ئێمە دەشارنەوە کە ناردوومانە، دوای ئەوەی بۆ خەڵکیمان ڕوون کردۆتەوە لە کتێبەکاندا، ئا ئەوانە الله نەفرینیان لێدەکات و نەفرین کارانیش نەفرەتیان لێدەکەن.**

**هەروەها فەرموودەی الله تعالی: {وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ} [آل عمران : 187]**

**واتە: (یاد بێنەرەوە) کاتێک الله [تعالی] پەیمانی وەرگرت لەوانەی کتێبیان پێ بەخشراوە کە ڕوونی بکەنەوە بۆ خەڵکی و مەرامەکانی باس بکەن و نەیشارنەوە، کەچی خستیانە پشت خۆیان و بە نرخێکی هەرزان فرۆشتیان (ئەگەر هەموو دنیاش بێت، دینی بۆ بفرۆشی هەرزان فرۆشراوە و زەرەرێکی بێ سنوورە) ئای کە شتێکی بێ نرخیان کڕیوە و دەستیان کەوتووە.**

**لەوانە: واجب بوونی دوژمنایەتی کردنی کافران و موشریکان و خۆدوورخستنەوە لێیان و بڕینەوە لەگەڵیان.**

**وە لەوانەش: چەند شتێك دەربارەی ئەو شتانەی کە مرۆڤ پێی دەبێت بە هەڵگەڕاوە(مورتەد).**

**وە لەوانەش: ئەو شتانەی کە مرۆڤ تیایدا عوزر(بیانوو)ـی دەبێت لەسەر موافەقە(ڕازیبوون) لەگەڵ موشریکان و دەرخستنی گوێڕایەڵی بۆیان.**

**وە لەوانەش: مەسەلەی دەرخستنی دین (إظهار الدين).**

**وە لەوانەش: مەسەلەی بێهێزی و لاواز بوون(الإستضعاف).**

**وە لەوانەش: واجب بوونی کۆچکردن(هیجرەت) وە باسکردنی مانە و بەردەوام بوونی هیجرەت.**

**وە کتێبەکەم ناوناوە : (سَبِيلُ النَجَاةِ وَالفِكَاكْ مِنْ مُوَالاةِ المُرْتَدِّينَ وَالأَتْرَاكْ).**

**وە لە الله تعالی داواکارم کە بونیاتەکەی لەسەر نیەتپاکی و ئیخلاص بووبێت، وە ئەو کەسە سودی لێ وەربگرێت کە دەیخوێنێتەوە یان دەیبیستێت لەپێناو داواکردنی ڕزگاربوون و دەرچوون.**

# بەشێك

بزانە کە الله - سبحانه وتعالى - محمد(صلى الله عليه وسلم)ـی ناردووە بە هیدایەت و دینی حەق، ئەوەی کە بۆ خەڵکەکە دابەزی بۆی ڕوونکردنەوە، جا هیچ خێر و چاکەیەك نەما مەگەر ئیللا نیشانی دان و ڕێگای گەیشتن بەو خێر و چاکەیەی پێناساندن، وە هیچ شەڕ و خراپەیەك نیە مەگەر ئیللا ئاگاداری کردنەوە لێی وە ئەو دەرگایانەی داخست کە [بەرەو ئەو خراپەیە دەچن] و پێی دەگەیەنن.

وە گەورەترین شتیش لەمەدا ئەوەیە هەواڵی پێدان کە (ئیسلام بەنامۆیی دەستی پێکرد وە دووبارە نامۆ دەبێتەوە هەروەك سەرەتا) هەروەها هەواڵی پێدان بە دەرکەوتنی فیتنە کە وەکو ( بەشێکی شەوی تاریك وایە، پیاو تیایدا بە ئیمانداری بەیانی دەکاتەوە و بە کافری دەگات بە ئێوارە، یاخود بە ئیمانداری ئێوارە دەکاتەوە و بەکافری دەگاتەوە بە بەیانی، دینەکەی بۆ شتێکی کەمی دونیا دەفرۆشێت)، جا ڕوودانی ئەم شتانە و هاوشێوەکانیان کاتێ ڕوویاندا بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە [محمد(صلى الله عليه وسلم)] نێردراوی الله ـیە.

وە هەروەها ئەوەش کە هەواڵی پێداوە ئەوەیە کە ئوممەتەکەی شەڕ لەگەڵ تورکە کافرەکان دەکات، وە هەروەها وەسفی کردوون بەوەی کە ئەوان چاویان بچووکە، وە لوتیشیان بچووکە، دەموچاویان وەك بلێی قەڵغانی کوتەکە، وە مانای [ذلف الأنوف] : واتە لوتیان کورت و پانە [بچووکە].

لە ئەبی هورەیرە(رضي الله عنه) ڕیوایەتکراوە لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا التُّرْكَ عِرَاضَ الْوُجُوهِ صِغَارَ الْعُيُونِ، ذُلْفَ الْأُنُوفِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ»

واتە: قیامەت هەڵناستێت تاکو شەڕ لەگەڵ تورك نەکەن، دەموچاویان پانە چاویان بچووکە، لوتیان کورتە، دەموچاویان وەك بلێی قەڵغانی کوتەکە.

الذهبی لە تلخیص دەربارەی ئەم فەرموودەیە فەرموویەتی: صەحیحە.

**هەروەها المجان: کۆی وشەی (مجن)ـە، کە بریتیە لە قەڵغان، مەبەست پێی ئەوەیە کە دەموچاویان لاکێشەییە کە سەرەوەی ڕوومەتیان(ژێرچاویان) دیار و ڕوونە (سوورە)، ئەمە مانای ئەو وتانەیە لە تەفسیری البغوی.**
**جا لە حیکمەتی الله تعالی و دادوەریەکەی ئەوە بوو کە لە سەدەی سێزدەهەم دەسەڵاتداری کردن و ئەوانیش لەسەر خەڵکی خاکی نەجد دەرچوون، ئەویش ئەوکاتەی کە میللەتی حەنیفیەت(میللەتی ئیبراهیم) دەرکەوت تێیاندا وە بانگەوازیان کرد بۆ ڕێبازی محمد ـیەت، بەڵام لە هەندێکیان تاوان ڕوویدا بەهۆیەوە ئەو دەوڵەتە کوفرییە دەسەڵاتدار بوو وە زاڵ بوو [بەسەریاندا]، جا ئەو شتەی کە لە قەدەرە ئەزەلیەکان چەسپاو و جێگیرە ڕوویدا، ئەگەرچی ئەحکامە شەرعیەکان ئەو شتە جائیز ناکەن [بەڵکو قەدەغەکراوە]، هەروەها الله تعالی لێی ناپرسرێتەوە کە چی دەکات وە ئەوان [مرۆڤ] لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت.**
**وە شوێنکەوتووانی ئیسلام بە شتانێك تاقیکرانەوە بەو کاتانە دەچێت کە شێخی ئیسلام ئبن تەیمیە باسی کردووە لەکاتی دەسەڵاتدارێتی و زاڵبوونی تەتار لە سەردەمی خۆیدا، کە ئەوانیش [تەتار] تورکە بیابانیەکان بوون [کە لە بیابان و ناوچە دوور لە شارەکان دەژیان]، بۆیە بە گونجاوی دەزانین کە هەندێ لە وتەکانی باس بکەین.**
**[إبن تیمیة] رحمە الله تعالی فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو فیتنەیەی کە موسڵمانان پێی تاقیدەکرێنەوە لەگەڵ ئەو دوژمنە خراپەکارە کە لە شەریعەتی ئیسلام دەرچووە، ئەم فیتنەیەش هاوشێوەیە لەگەڵ ئەو ڕووداوانەی کە بەسەر موسڵماناندا هات لەگەڵ دوژمنەکەیان لەسەردەمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەو جەنگ و غەزایانەی کە الله تعالی لە کتێبەکەیدا [دەربارەی ئەو ڕووداوانە] ئایەتی دابەزاندووە، وە پێغەمبەرەکەی و ئیمانداران پێی تاقیکرانەوە، کە ئەمەش سەرمەشق و نمونەیەکی چاکە بۆ ئەو کەسەی کە داوای پاداشتی الله و ڕۆژی دوایی دەکات و یادی الله زۆر دەکات، تاکو ڕۆژی قیامەت.**

چونکە بەڵگە و نووسراوەکانی قورئان و سوننەت، کە بریتین لە بانگەوازی محمد(صلى الله عليه وسلم)، باس لە گشتگیری دروستکراوان دەکات بە گشتگیری دەربڕین(لفظی) و گشتگیری

مەعنەوی، وە بە گشتگیری مەعنەوی هەروەها پەیمانەکانی الله لە قورئان و سوننەتەکەی باس لە کۆتایی ئەم ئوممەتە دەکات هەروەك چۆن باسی سەرەتاکانی دەکات.

وە هەروەها الله تعالی چیرۆکی ئوممەتەکانی پێشووی بۆمان گێڕاوەتەوە بۆ ئەوەی ببێتە پەند و عیبرەت بۆمان ئێمەش هەڵسین حاڵی خۆمان بە حاڵی ئەوان بچوێنین، هەروەها کۆتاییەکانی ئوممەتەکان بە سەرەتاکانیان پێوانە بکەین [قیاس بکەین]، جا لەمەشدا بۆ کەسی ئیمانداری پاشین هاوشێوە دەست دەکەوێت بەو شتانەی کە بۆ ئیمانداری پێشوو هەبووە، وە هەروەها بۆ کافر و دووڕوو[مونافیق]ـی پاشین هاوشێوە دەست دەکەوێت بەو شتانەی کە بۆ کافر و مونافیقی پێشوو هەبووە.

هەروەك الله تعالی کاتێك چیرۆکی یوسف بە درێژی باس دەکات و باسی پێغەمبەرانی تریش بە کورتی باس دەکات فەرموویەتی: {لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ} واتە: سوێند بێت بەالله بەڕاستی لە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی پێغەمبەران پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند.

وە کاتێك چیرۆکی فیرعەونی گێڕایەوە فەرمووی: {فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَىٰ (25) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ} واتە: ئەوسا الله [تعالی] دووچاری سزای قیامەت و دنیای کرد. بەڕاستی ئا لەو بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ هەرکەسێك لە الله بترسێت.

وە دەربارەی گەمارۆدانی [جوولەکەی] بنی النضير فەرموویەتی: {هُوَ الَّذِي أَخْرَجَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مِن دِيَارِهِمْ} واتە: الله ئەو زاتەیە، ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خاوەنانی کتێب، هەڵیکەندن لە شوێنەواریان و ناچاری کۆچی کردن.

تا کۆتایی ئایەتەکە کە فەرموویەتی: {فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ}

واتە: دەسا پەند وەرگرن ئەی ئەوانەی خاوەن بینایی و بەرچاو ڕوونین.

جا فەرمانی پێکردووین کە پەند وەرگرین لەوانەی کە پێش ئێمە بوون لەو ئوممەتە و لە ئوممەتانی تریش، وە لە چەندین جێگادا باسی کردووە کە سوننەتی الله لەمەدا سوننەتێکی بەردەوامە و گەڕانەوەی هەیە

جا الله تعالى فەرموویەتی: {لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا (60) مَّلْعُونِينَ ۖ أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا (61) سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا}

واتە: ئەگەر دووڕووەکان و دڵ بیمارەکان و پڕوپاگەندەچیەکان لە مەدینەدا کۆڵ نەدەن، مۆڵەت و هانی تۆ دەدەین کە تۆڵەیان لێ بسێنیت، (لەوەودوا زۆربەیان دەربەدەر بکەیت)و کەمێکیان نەبێت لە شاردا نەمیننەوە.

(ئەوانە) نەفرین لێکراون لە هەرکوێ بژین، دەبیت دەستگیر بکرێن و دەبێت بکوژرێن.

(دژایەتی ئەو دووڕووانە) لەبەرنامەی الله ـیە لە ڕابوردووشدا ئەنجامدراوە، هەرگیز گۆڕانکاری نابینی لە یاساو بەرنامەکانی الله.

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {وَلَوْ قَاتَلَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوَلَّوُا الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا (22) سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا}

واتە: خۆ ئەگەر ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دژی ئێوە جەنگیان بەرپا بکردایە، ئەوەدەشکان و هەڵدەهاتن، پاشان دۆست و پشتگیرێکیان نەدەبوو.

(شکست و هەڵاتنی کافران لەجەنگی موسوڵماناندا) هەردەم بەرنامەو یاسای الله ـیە بەڕاستی هەروا بووە لەزووەوە، هەرگیز نابینیت بەرنامەو یاسای الله گۆڕانی بەسەردا بێت.

جا الله سبحانه وتعالى هەواڵیداوە کە بابەت و سەرەنجامی کافرانی پاشین هەمان بابەت و سەرەنجامی کافرانی پێشینە.

بۆیە پێویستە لەسەر کەسانی عاقڵ کە پەند وەرگرن لە سوننەتی الله و ڕۆژگارەکەی بەسەر بەندەکانی، هەروەها سەرەنجامی ئوممەتەکانی و عادەتەکانیان، بە تایبەت لە ڕووداوێکی گەورەی وەك ئەمە کە هەواڵ و خەبەرەکەی تێدا چەسپاو و جێگیر بووە

وە شەڕ و خراپەکەشی بە خێرایی بە هەموو وڵاتی موسڵمانان بڵاوبۆتەوە، وە لەنێو ئەمەشدا نیفاق و دووڕوویی نێوچەوانی سەری خۆی دەرخستووە، وە تیایدا کوفر ددانەکانی خۆی ئاشکرا کرد[دەریخست]

وە خەریکبوو تیایدا ئەستونی کتێبەکە[قورئان] لەبن بێت و بکەوێت، وە پەتی ئیمان بپسێت و لەبن بێت، وە خاك و ماڵی موسڵمانان بەیەکجاری لەناوبچێت و نەمێنێت، وە ئەم دینە نەمێنێت و لەناوبچێت بە زاڵبوون و دەستبەسەرداگرتنی خراپەکارانی تەتار، وە کەسانی دووڕوو [مونافیق] و ئەوانەش کە نەخۆشی لە دڵیاندا هەبوو وا گومانیان برد کە {مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا} واتە: بەڵێنی الله و پێغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەڵەتاندن بوو، هیچی تر نەبوو. وە وایان دانا کە حیزبی الله و پێغەمبەرەکەی هەرگیز جارێکی تر ناچنەوە نێو ماڵ و خاکیان، وە ئەم شتەش لەدڵیاندا جوان بوو وە گومانی خراپیان برد، وە بەڕاستی بوون بە گەل و قەومێکی دۆڕاو و لەناوچوو.

وە فیتنەیەك دابەزی تیایدا کەسی بەئارام و خۆڕاگر بە شێت و شێواو وازی لێدەهێنرا، وە پیاوی هۆشدار و ئاگاداری بردە ڕیزی کەسی سەرخۆش و بێئاگا، وە پیاوی عاقڵ و هۆشمەند - بەهۆی زۆری وەسوەسەکان - وایلێهات کە نە بەئاگابێت و نە خەوتووش بێت، وە تیایدا دڵی کەسانی ناسیاو و براکان بوون بە دڵی نەناسراو، تەنانەت پیاو لەخودی خۆیدا سەرقاڵ بوو لەوەی کە بچێت بەهانای کەسی توش بوو بە بەڵا و ناڕەحەتی، وە تیایدا الله تعالی جیاکردنەوەی کرد لەنێوان کەسانی خاوەن بینایی و دڵنیایی(یەقین) هەروەها ئەو کەسانەی کە باوەڕی دڵیان لاواز بوو وە ئەوانەی نەخۆشی یاخود نیفاق و دووڕویی لەدڵیان هەبوو.

[وە بەو فیتنە و تاقیکردنەوەیە] هەندێ کەسی خستە پلەوپایەی بەرز، لەهەمانکاتدا هەندێ کەسیشی نزمکردەوە بۆ جێگەی نزم و لەناوبەر، وە بەهۆیەوە کارە خراپەکانی هەندێ کەسی سڕیەوە، وە تیایدا جۆرەها ڕووداو و بەڵا ڕوویدا کە دەکرێت ببێتە پوختەی قیامەتی گەورە. چونکە خەڵکی تیایدا جیابوونەوە لەنێوان دڵخۆش و ناڕەحەت(خۆشی نەدیو)، هەروەك چۆن لەڕۆژی پەیماندراو(قیامەت) لێکجیادەبنەوە، وە هیچ شتێك سودێکی پاك و تەواو ناگەیەنێت تەنها ئیمان(باوەڕ) و کارە چاکەکان نەبن، هەروەها چاکەکاری و ترسان لە الله

**وە تیایدا نهێنی و پەنهانیەکان ئاشکرا بوون، وە ئەو شتە شاراوانەی کە دەروونەکان حەشاریان دابوو دەرکەوت، وە دەرکەوت تیایدا کە وتە و کاری خراپە خیانەت لە خاوەنەکەی دەکات لەکاتێکدا کە زۆرترین پێویستی هەیە پێیان.**

**وە زەمی گەورەکان و سەرکردەکانی کرد ئەوانەی کە گوێڕایەڵی کردن و سەریان لێی شێواند، هەروەها سوپاسی الله ـی کرد ئەو کەسەی کە ڕاستگۆ بوو لەئیمانی خۆیدا و لەگەڵ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ڕێگەی گرتەبەر، وە ڕاستی و حەقیقەتی ئەو هەواڵانە دەرکەوت کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هەواڵی پێدابوون کە ڕوودەدەن [جا ڕوویاندا]، وە دڵی ئەو کەسانەش موافەقە و ڕێکوپێکی کرد لەگەڵ ئەوانەی کە لەم ئوممەتەدا دوێنراون(واتە ئیلهامیان هەیە)، هەروەها ئەو موژدانەش هاتنەدی کە ئیمانداران بینیان، هەروەها کۆمەڵی ڕزگاربوو و سەرکەوتوو(الطائفة المنصورة) دەرکەوت تیایدا، ئەوانەی کە زیانیان پێناگات لەلایەن ئەو کەسانەی کە پێچەوانەیان دەکەن و ئەوانەش کە پشتیان لێ هەڵدەکەن تا ڕۆژی قیامەت.**

**لەکاتێك کە خەڵکەکە بوون بە سێ حیزب و دەستە: ( حیزبێکی تێکۆشەر بۆ سەرخستنی دین، وە حیزبێکیش پشتی لێهەڵکردووە، وە حیزبەکەی تریش لە شەریعەتی ئیسلام دەرچووە).**

**خەڵکیش دابەش بوون لەنێوان کەسی خاوەن پاداشت و خاوەن بیانوو، وە هی تریش [نەفسیان] سەرگەردان و مەغرور بوو لە ئاستی الله.**

**وە ئەم تاقیکردنەوەیەش لەلایەن الله بەڕاستی جیاکردنەوە و دابەشکردن بوو: {لِّيَجْزِيَ اللَّهُ الصَّادِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ إِن شَاءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا}**

**واتە: تاکو الله [تعالی] پاداشتی ڕاسگۆیان بەهۆی ڕاستیەکەیان بداتەوە، هەروەها سزاو تۆڵەی دووڕووەکانیش بدات ئەگەر بیەوێت، یان تۆبەو پەشیمانیان لێ وەردەگرێت، چونکە بەڕاستی الله هەمیشە و بەردەوام لێ خۆشبوو میهرەبانە.**

**[مجموع الفتاوى 28/ 425-427].**

گوتم[شێخ حەمەد بن عەتیق] : وە ئەمەی کە باسی کرد لە تاقیکردنەوە و توشبوون بە فیتنە هەمان شێوە و هاوشێوەمان بینی یاخود گەوەرتر لەوە لەم سەردەمانەدا.
بە هەمان شێوە خەڵکی دابەشبوونە سێ بەش: یەکێکیان سەرخەری دینی ئیسلامن، وە هەوڵیدا بۆ ئەمە بەهەموو توانایەکی، وە ئەوانیش ژمارەیان کەمە وە لای الله گەورەترین پاداشتیان هەیە.
بەشی دووەم: پشتهەڵکردوون لە ئەهلی ئیسلام، وە [پشتیوانیان ناکەن] و وازیان هێناوە لەیارمەتیدانیان.
بەشی سێیەم: دەرچوون لە شەریعەتی ئیسلام بە سەرخستنی ئەهلی شیرك و یارمەتیدان و ڕێنیشاندانیان.

هەروەها الطبرانی ڕیوایەتی کردووە لە إبن عباس و ئەویش لە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی: (من أعان صاحب باطل لیدحض بباطله حقا فقد برئت منه ذمة الله وذمة رسوله)
واتە: هەرکەسێ پشتگیری خاوەن ناحەق(باطل)ـێك بکات بۆ ئەوەی بە ناحەقەکەی خۆی حەق بەدرۆبخاتەوە ئەوا زیممە(پاراستن)ـی الله و پاراستنی پێغەمبەرەکەی لێ بێ بەری دەبن.

## بەشێك

## كە ئەمەش دەستپێكی باسكردنی مەبەستەكەیە

ئەما دوژمنایەتی كردنی كافران و موشریكان، ئەوە بزانە كە الله تعالی واجبی كردووە و جەختی كردۆتەوە لەسەر واجب بوونی، وە دۆستایەتی كردنی كافرانی حەڕامكردووە و هەڕەشە و ئاگاداری توندی لەسەر داوە، تەنانەت لە كتێبی الله تعالی هیچ حوكمێك نیە ئەوەندەی ئەم حوكمە بەڵگەی لەسەر بێت وە هیچ حوكمێك نیە كە ڕوونتر بێت لەم حوكمە دوای واجب بوونی تەوحید و حەڕامكردنی پێچەوانەكەی [كوفر و شیرك]، الله تعالی فەرموویەتی: {وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ} [البقرة : 11]

واتە: ئەوانە كاتێک پێیان دەوترێت تۆوی گوناهو تاوان و خراپەكاری مەچێنن لە زەویدا، دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها چاكسازی دەكەین!.

إبن جرير [الطبری] رحمه الله تعالی فەرموویەتی: جا ئەهلی دووڕووی(نیفاق) فەساد و خراپەكارن لەسەر زەوی بەهۆی سەرپێچیكردنی پەروەردگاریان، هەروەها ئەنجامدانی ئەو شتانەی كە نەهی كردووە لە ئەنجامدانی، هەروەها وازهێنان لە فەڕیزەت و واجبەكانی، وە گومانكردنیان لە دینەكەی[دینی الله] كە هیچ كاروكردەوەیەك لە هیچ كەسێك قبوڵ ناكرێت مەگەر تەنها بە باوەڕپێكردن و بەڕاست زانینی نەبێت هەروەها بوونی یەقین و دڵنیایی بە حەقیقەت و ڕاستەقینەیی ئەم دینە، هەروەها درۆكردنیان بەوەی كە ئیماندارن بە لاف لێدانی خۆیان جیا لەو گومان و بەدرۆخستنەوەیەی كە لەسەریدان، هەروەها سەرخستنی ئەهلی بەدرۆزانینی الله و كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانی بەسەر ئەولیاء و دۆستانی الله ئەگەر ڕێگایەك بۆ ئەم شتە بدۆزنەوە.

إبن كثير [رحمه الله] فەرموویەتی: جا ئەمەی كە وتوویەتی چاكە، چونكە لە فەساد و خراپەكاری ئەوەیە كە ئیمانداران هەڵسن كافران بكەن بە دۆست و ئەولیای خۆیان، هەروەك الله تعالی فەرموویەتی:{وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ} [الأنفال : 73]

**واتە: ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن و پشتیوانی لە یەکتر دەکەن، خۆ ئەگەر ئێوەی ئیماندار کۆمەک بەیەکتر نەکەن و پشتی یەکتر نەگرن ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی و ناکۆکی و گوناهو تاوانی گەورە پێش دێت.**

**جا موالاة و دۆستایەتی نێوان کافران و ئیماندارانی بڕیوەتەوە هەروەك الله تعالی فەرموویەتی:**

**{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ} [النساء : 144]**

**واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بێ باوەڕان مەکەنە یارو یاوەری خۆتان لەجیاتی ئیمانداران.**

**هەروەها وتەکەی کە فەرموویەتی: {إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ} واتە: ئێمە دەمانەوێت نەرم و نیانی(نزیککردنەوە لە یەکتر) و چاکسازی بکەین لەنێوان ئیمانداران و کافران، وە خۆگونجاندن و سوڵح بکەین لەگەڵ ئەوانە و ئەمانەش، الله تعالی دەفەرموویت: {أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ} دەفەرموویت: نەخێر ئەو شتەی ئەوان شایەتی لەسەر دەدەن و دەڵێن ئەوە چاکسازیە ئەو شتە بریتیە لە خودی فەساد و خراپەکاری، بەڵام لەگەڵ نەزانیەکەیان هەستیش بەوە ناکەن کە ئەو شتە فەساد و خراپەکاری بێت..اهـ.**

**جا ئەمەی کە باسی کرد سوێند بە الله بیستمان و ئەهل و شوێنکەوتووانیمان بینی، چونکە ئەوان ئەگەر پێیان بوترێت: چی وای لە ئێوە کردووە کە لەگەڵ ئەهلی خراپەکاری و فەساد دابنیشن؟ دەڵێن: دەمانەوێ حاڵ و ئەحواڵەکانی خۆمان چاك بکەین، وە دونیای خۆمان دەربهێنین لێیان، وە لای ئەوان دەستێکمان هەبێت.**

**وە هەندێکیشان ئەگەر گومانی خراپ بە الله بەرێت بەهۆی زاڵبوون و بەتوانابوونی ئەهلی باتڵ و ناحەق، وە کەسانێکی بینی کە پەیوەندی هەیە لەگەڵیان و پێیان دەگات ئەوا دەیکاتە هاوڕێ و ڕازیدەبێت کە یەکێك بێت لەوانەی کە لەگەڵی دادەنیشن، بە زمانی حاڵی خۆی دەڵێت: {نَخْشَىٰ أَن تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ} واتە: دەترسین بەڵا و ناڕەحەتیەك توشمان ببێت.**

**{أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ} [البقرة : 12]**

**واتە: ئاگادار بن، کە ڕاستی هەر ئەوانە تۆوی خراپە دەچێنن، بەڵام ( هەستی پێ ناکەن و خۆیانی لێ گێل دەکەن.**

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا (138) الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا }

واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مژدە بە دووڕووەکان بدە کە بەڕاستی سزایەکی بەئێشیان بۆ ئامادە کراوە!!

ئەو دووڕووانەی کە بێ باوەڕەکان دەکەنە پشتیوان و یارویاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئایا دەیانەوێت عیززەت و دەسەڵات و سەربەرزیان لای ئەوان دەست بکەوێت؟ (ئەوانە بەهەڵەدا چوون) چونکە بەڕاستی عیزەت و باڵاداستی و سەربەرزیی هەر هەمووی بۆ الله ـیە، تا ئەو جێگەیەی کە الله تعالى فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا مُّبِينًا} [النساء : 144]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بێ باوەڕان مەکەنە یارو یاوەری خۆتان لەجیاتی ئیمانداران، ئایا دەتانەوێت بە دەستی خۆتان بەڵگەیەکی ئاشکرا بدەنە دەست الله لەسەر خۆتان.

إبن كثير - رحمه الله - فەرموویەتی: ئینجا وەسفی کردن بەوەی کە ئەوان کافران دەکەنە دۆست و هاوەڵی خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، واتە ئەوان لەگەڵیاندان بەڕاستەقینەیی، دۆستایەتیان دەکەن و بە سۆز و نەرمونیانیەوە دەچن بەرەو لایان [بۆیان دەنوێنن]، لەوکاتەی کە بەتەنیا لەگەڵیان دەمێننەوە پێیان دەڵێن: ئێمە لەگەڵتانداین، بەڕاستی ئێمە گاڵتە دەکەین بە ئیمانداران کاتێك ڕازیبوون و موافەقەیان بۆ دەردەخەین، الله تعالى بە ئینکاریکردن لەو ڕێگایەی گرتوویانەتە بەر لە دۆستایەتیکردنی کافران فەرموویەتی: {أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ} واتە: ئایا ئەوان شکۆمەندی و سەربەرزیان لای ئەوان دەوێت؟

ئینجا هەواڵیداوە بەوەی کە سەربەرزی و عیززەت هەمووی بۆ الله ـیە بە تەنها، هیچ هاوەڵ و شەریکێکی بۆ نیە نە بۆ ئەو و نە بۆ ئەوەش کە عیززەت و سەربەرزی پێ بەخشیێن، هەروەك الله تعالى لە ئایەتێکی تر فەرموویەتی: {مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّهِ الْعِزَّةُ جَمِيعًا} واتە: ئەوەی سەربەرزی وپایەبڵندی دەوێت، با بزانێت کە هەموو سەربەرزی و پایە بڵندیەک هەر بۆ الله ـیە.

**وە الله تعالی دەفەرمووێت: {وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ} واتە: عیززەت و دەسەڵات و پایەداری هەر شایستەی الله و پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانە.**

**مەبەستیش لەو جەخت لێکردنەوەیە بۆ داواکردنی عیززەت و سەربەرزیە لەلای الله تعالی، وە چوون بەرەو بەندایەتی الله، وە ڕێکبوون و گونجان لەڕیزی بەندە ئیماندارەکانی، ئەوانەی کە سەرکەوتن و پشتیوانیان بۆ هەیە لەم ژیانەی دونیا و ئەو ڕۆژەش کە شاهیدەکان هەڵدەستن شایەتی دەدەن.**

**گوتم[شێخ حەمەد] : جا ئەگەر دۆستایەتی کافران لە کردەوەی مونافیقەکان[دووڕووەکان] بێت، ئەوا ئەمە بەسە بۆ حەڕامبوونی و نەهی لێکردنی.**

**هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ}**

**واتە: نابێت ئیمانداران، کافران بکەنە پشت و پەناو یارو یاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئەوەی کاری وا بکات، ئەوکارەی دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی ئیمانیی بە الله نامێنێت.**

**جا الله تعالی نەهی کردووە لە دۆستایەتی کافران ئینجا فەرموویەتی: {وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ} هەرکەسێ ئەمە بکات، واتە: هەرکەسێ دۆستایەتی کافران بکات، ئەوا ئەو کەسە لای الله بە هیچ شتێك نامێنێتەوە و هیچ پەیوەندیەکی بە الله نامێنێت واتە: ئەو لە الله بەریء بوو، وە بە هەمان شێوە الله ـش لەو بەریء بوو، ئەمەش هەڕەشەیەکی توندە و ئاگاداریەکی دڵنیایی و تەئکیدیە، بۆ پاراستنی ئیسلام و تەوحید.**

**هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ (80) وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ}**

**واتە: زۆربەیان دەبینیت ڕازین بەخۆشەویستی و پشتیوانی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، سوێند بە الله دەست پێشکەرییەکی خراپیان بۆ خۆیان ئەنجامداوە کە الله ـیان لە خۆیان تووڕە کردووە (بەو کارەیان)، (لە قیامەتیشدا) لەناو سزای دۆزەخدا دەبێت بۆ هەمیشە بمێننەوە.**

خۆ ئەگەر ئەوانە باوەڕیان بەالله و بەم پێغەمبەرەو ئەو قورئانە ببوایە کە بۆی دابەزیوە، ئەوە ئەوانەیان نەدەکرد بەخۆشەویست و سەرپەرشتیاری خۆیان، پشتیان بەوان نەدەبەست بەڵام زۆربەیان تاوانبارو لادەرو یاخین.

شێخی ئیسلام [إبن تيمية] رحمه الله فەرموویەتی: ( الله تعالى ڕوونی کردۆتەوە کە ئیمانهێنان بە الله و پێغەمبەرەکەی پەیوەستە بە دۆستایەتی نەکردنیان[کافر و موشریکان]، جا جێگیربوون و چەسپانی دۆستایەتی کردنیان نەمانی ئیمان[باوەڕ] لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، چونکە نەمانی پەیوەست دەبێتە هۆی نەمانی پەیوەست پێکراو).

گوتم [شێخ حەمەد] : الله تعالى لەسەر دۆستایەتی کردنی کافران توڕەیی خۆی و مانەی تاهەتایی لە سزای دۆزەخ داناوە، هەروەها هەواڵیداوە کە دۆستایەتی کردنی کافران ڕوونادات مەگەر تەنها لەلای کەسانی بێباوەڕ[بێ ئیمان] نەبێت، ئەما ئەهلی باوەڕداران بە الله و کتێبەکەی[قورئان] و پێغەمبەرەکەی، ئەوان دۆستایەتیان ناکەن، بەڵکو دوژمنایەتیان دەکەن، هەروەك الله تعالى هەواڵیداوە دەربارەی ئیبراهیم و ئەو پێغەمبەرانەش کە لەگەڵیدابوون وەك لەداهاتوو ڕوونکردنەوەی لەسەر دەدرێت إن شاء الله تعالى.

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (51) فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَارِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰ أَن تُصِيبَنَا دَائِرَةٌ ۚ فَعَسَى اللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ فَيُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا أَسَرُّوا فِي أَنفُسِهِمْ نَادِمِينَ} [المائدة : 51-52]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی الله هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

بە ڕوونی دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشە و (ئیمان لاوازن) بەپەلە دەچن بۆ لایان (بە زمانی حاڵ) دەڵێن: دەترسین بەڵایەکمان تووش بێت یان کارەساتێکمان بەسەر بێت، جا دوور نیە و لەوانەیە بەم نزیکانە الله [جل جلاله] سەرکەوتن ببەخشێت (بە ئیمانداران) یاخود بەشێوەیەکی یەکسەریی بە موعجیزەیەک لەلایەن خۆیەوە (سەرکەوتنیان پێببەخشێت)

ئەوکاتە باوەڕلاوازان پەشیمان دەبنەوە لەسەر ئەو نهێنی و خەتەرە و خەیاڵەی لە دڵ و دەروونیاندا شاردبوویانەوە.

جا الله تعالى نەهی کردووە لە ئیمانداران کە دۆستایەتی جوولەکە و گاورەکان بکەن، وە باسی کردووە کە هەرکەسێ دۆستایەتیان بکات و بیانکاتە هاوەڵی خۆی ئەوە لەوانە [حیسابی ئەوانی بۆ دەکرێت]، واتە هەرکەسێ دۆستایەتی جوولەکەی کرد و کردی بە هاوەڵی خۆی ئەوا ئەویش جوولەکەیە، وە هەرکەسێ گاور بکاتە هاوەڵی خۆی ئەوا ئەویش گاورە[ دەبێتە گاور !].

هەروەها إبن أبي حاتم - رحمه الله - لە محمد ـی کوڕی سيرين رحمه الله تعالى ڕیوایەتی کردووە، فەرموویەتی: عبدالله بن عتبة - رحمه الله - دەفەرمووێت: (ليتق أحدكم أن يكون يهوديا أو نصرانيا وهو لا يشعر) واتە: با هەر یەکێك لە ئێوە بترسێت لەوەی ببێت بە جوولەکە یان ببێت بە گاور لەکاتێکدا هەستیشی پێناکات.

فەرمووی: گومانمان کرد کە مەبەست پێی ئەو ئایەتە بێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ} تاکو وتەی الله تعالى کە فەرموویەتی: {فَإِنَّهُ مِنْهُمْ}.

جا بە هەمان شێوە هەرکەسێ دۆستایەتی تورکەکان بکات ئەوا خۆی تورکییە[دەبێتە تورکی]، وە هەرکەسێ دۆستایەتی بیانیەکان(أعاجم) بکات ئەوا بیانییە(أعجمی)، جا جیاوازی نیە لەنێوان ئەو کەسەی کە دۆستایەتی ئەهلی هەردوو کتێبەکە بکات یاخود کافرانی تر جگە لەوان.

ئینجا الله تعالى هەواڵیداوە کە (أن الذين في قلوبهم مرض) ئەوانەی کە لە دڵیان نەخۆشی هەیە، واتە: گومان و شوبهەیان لەو دینە هەیە، بەخێرایی دەچنە لای کافران و دەڵێن: (نخشى أن تصيبنا دائرة) دەترسین کە کارەساتێکمان توش ببێت، واتە: ئەگەر ئینکاری دۆستایەتیکردنی کافرانیان لێبکرێت، وتیان: دەترسین کە سەرکەوتن و دەسەڵات لە داهاتوودا بۆ ئەوان بێت و ئەوانیش زاڵ بن بەسەرماندا، جا ماڵ و سامانمان دەبەن و لە وڵاتەکانمان بەدەرمان دەنێن، کە ئەمەش گومانبردنی خراپە بە الله(ظن السوء بالله)، کە الله تعالى دەربارەی فەرموویەتی:

{الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا}

**واتە: ئەوانەی کە گومانی خراپ دەبەن بە الله، ئەو گومانە خراپەش هەر بە کارەسات بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، وە الله تعالى لێیان توڕە بوو وە نەفرەتی لێکردن و سزا و ئەشکەنجەیەکی زۆر خراپی بۆ ئامادەکردوون کە سەرەنجامێکی سامناك و خراپە.**

**هەر بۆیەش الله تعالى لە ئایەتەکەدا فەرموویەتی: {فَعَسَى اللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِ}**

**واتە: جا دوور نیە و لەوانەیە بەم نزیکانە الله [جل جلاله] سەرکەوتن ببەخشێت (بە ئیمانداران) یاخود بەشێوەیەکی یەکسەریی بە موعجیزەیەک لەلایەن خۆیەوە (سەرکەوتنیان پێببەخشێت).**

**(فعسى) : واجبە لەلایەن الله تعالى [کە ئەنجامی بدات]، جا سوپاس و ستایش بۆ الله تعالى کە فەتح و سەرکەوتنی نارد، لەئەنجامدا ئەوانەی گومانی خراپیان دەبرد لە دەروونی خۆیان پەشیمان بوونەوە لەو شتەی کە دەیانشاردەوە.**

**هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاءَ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} [المائدة : 57]**

**واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: نەکەن ئەوانە بکەنە پشتیوان و جێگەی متمانەی خۆتان کە گاڵتەو گەمەیان بە ئاینەکەتان کردووە، چ لە خاوەنانی کتێبی پێش خۆتان، چ لە بێ باوەڕان، لە الله بترسن و پارێزکاربن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن.**

**جا الله تعالى نەهی کردووە لەوەی کە خاوەنانی هەردوو کتێبەکە[جوولەکە و گاورەکان] و جگە لەوانیش لە کافران دۆستایەتیان بکرێت، وە ڕوونی کردۆتەوە کە دۆستایەتی کردنیان ئیمان و باوەڕ ناهێڵێت.**

**هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (23) قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ}**

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، باو و باپیران و براکانتان مەکەنە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان، ئەگەر ئەوان بێ باوەڕیان خۆشویست و هەڵیانبژارد بەسەر ئیمان و باوەڕدا، هەرکەس لە ئێوە پشت بەوان ببەستێت و خۆشی بوێن ئائەوانە هەر ستەمکارن.
(ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: ئەگەر باوو باپیرانتان و براکانتان و هاوسەرانتان و عەشیرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێک کە بەدەستان هێناوە، یاخود بازرگانیەک دەترسن کە شکان و بێ بازاڕی ڕووی تێبکات و خانووبەرە و کۆشک و تەلارێک کە حەز دەکەن لێتان تێک نەچێت و دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشەویستترو نازدارتر بێت لە الله و پێغەمبەرەکەی و جیهادو تێکۆشان لەپێناو ڕێبازی ئەو زاتەدا، دە ئەوە چاوەڕوان بن، هەتا الله تعالی دێت بە فەرمانەکانیەوە و (تۆڵەتان لێ دەسێنێت)، الله ـی پەروەردگاریش هیدایەت و ڕێنموویی قەومی یاخی و لە سنوور دەرچوو نادات.
جا الله تعالی نەهی کردووە لەوەی کە ئیماندار دۆستایەتی باوك و برای خۆی بکات ئەوانەی کە نزیکترین کەسن لێیەوە کە ئەگەر دینەکەیان دینێکی تر بێت جگە لە دینی ئیمان[ئیسلام].
وە ڕوونیشی کردۆتەوە کە ئەو کەسەی دۆستایەتی باوك و برای خۆی دەکات ئەگەر کافر بن ئەوا ئەو کەسە ستەمکارە{ظالمه}، ئەی چی دەربارەی کەسێك کە دۆستایەتی کافران بکات لەکاتێکدا ئەو کافران دوژمنی خۆی و باوك و دینەکەی ئەون؟! بەڵێ سوێند بە الله ئەو کەسە ستەمکارترینی ستەمکارانە.
ئینجا الله تعالی ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو هەشت شتە نابن بە عوزر و بیانوو بۆ دۆستایەتی کردنی کافران، وە نەبووە بۆ هیچ کەسێك کە دۆستایەتیان بکات لەترسی باوکی، یان براکەی یان وڵاتەکەی یان ماڵ و سامانەکەی یان پەیوەست بوونی بە عەشیرەتەکەی، یاخود ترسان لە هاوسەرەکانی، چونکە بەڕاستی الله تعالی دەرگای بیانوو هێنانەوەی داخستووە بەو هەشت شتە، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە هیچ کەسێك نیە دۆستایەتی موشریکان بکات مەگەر ئەوەتا بیانوو بەو شتانە دەهێنێتەوە یان بە هەندێکیان، وە ڕوون بوویەوە کە ئەوانە عوزر نین.

جا ئەگەر وترا: زۆرێك لە موفەسیرەكان دەڵێن: ئەم ئایەتە لەسەر بابەتی جیهاد هاتۆتە خوارەوە.

وەڵامدانەوەی ئەمەش بە دوو ڕوواڵەت دەبێت:

ڕووی یەكەم دەڵێین: ئەگەر ئەم هەشت شتە نەبن بە بیانوو[عوزر] بۆ وازلێهێنانی جیهاد كە فەڕزی كیفایەتە ئەوا ئەولاترە كە نابێتە بیانوو بۆ وازهێنان لە دوژمنایەتی كردنی موشریكەكان و پەیوەندی بڕینەوە لەگەڵیان.

ڕووی دووەم: خودی ئایەتەكە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە باسمان كرد، هەروەك چۆن بەڵگەیە لەسەر جیهاد، چون الله تعالی فەرموویەتی: {أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ}

واتە: خۆشەویستتر بێت لاتان لە الله و پێغەمبەرەكەی و جیهادكردن لەپێناویدا.

ئەمەش چونكە خۆشویستنی الله تعالی و پێغەمبەرەكەی دوژمنایەتی كردنی موشریكان و پەیوەندی بڕین لەگەڵ خۆی دێنێت و پێویستی دەكات بەسەر ئەم هەشت شتەدا، وە پێشخستنی [دوژمنایەتی كردنیان] بەسەر ئەو شتانە، هەروەك چۆن خۆشویستنی جیهاد دەبێتە هۆی هەڵبژاردن و پێشخستنی جیهادەكە بەسەریاندا، وبالله التوفیق.

جا ئەمەش ئەگەر كەسی دڵساف و خاون ئینصاف گوێی لێبێت ئەوا [بابەتەكە] ئاشكرا و ڕوون دەبێت لەلای، بەڵام ئەو كەسەی كە الله تعالی بینابیەكەی كوێركردووە بەهۆی دەمارگیری و تەعەصوبەكەی ئەوا نمونەی هەر وەك ئەوە وایە كە الله تعالی فەرموویەتی: {إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ (96) وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ} [یونس : 96-97]

واتە: بەڕاستی ئەوانەی كە بڕیاردادەی پەروەردگارت لەسەریان چەسپا، ئەوانە: باوەڕ ناهێنن. ئەگەر چی هەرچی بەڵگەو موعجیزە هەیە بۆیان پێش بێت، ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن هەتا سزای بەئێش و ئازار دەبینن.

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {وَالَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُم مِّن وَلَايَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا} واتە: وە ئەوانەی كە ئیمانیان هێناوە و هیجرەتیان نەكردووە ئەوا پاراستن و سەلامەتی ئەوان لەسەر ئێوە نیە.

ئینجا فەرموویەتی: {وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ} [الأنفال : 73]

واتە: ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن و پشتیوانی لە یەکتر دەکەن، خۆ ئەگەر ئێوەی ئیماندار کۆمەک بەیەکتر نەکەن و پشتی یەکتر نەگرن ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی و ناکۆکی و گوناهو تاوانی گەورە پێش دێت (ئازار و ناخۆشی بۆ ئێوەی ئیماندار پێش دێت).

جا هەواڵیداوە کە کافران ئەگەر هەندێکیان دۆستایەتی هەندێکی تریان نەکەن بەوەی کە موسڵمانان جێ بهێڵن و موسڵمانانیش دەبێت دەستی خۆیان ببڕنەوە لێیان(دۆستایەتیان نەکەن)، گەرنا فیتنە و فەساد و خراپەی گەورە ڕوودەدات.

جا لێرەدا ڕوون بوویەوە کە دۆستایەتی موسڵمان بۆ کافر هۆکاری توشبوونە بە فیتنە لە دین، بە وازهێنان لە واجبەکانی و ئەنجامدانی حەڕامکراوەکانی و دەرچوون لە دروشمەکان و شەرائیعەکانی دین، وە هۆکارە بۆ فەساد و خراپی لە دین و جەستە و ماڵ و سامان، جا ئەمە لەکوێ و قسەی ئەهلی فەساد و بێ ئابڕووەکان لەکوێ کە دەڵێن: (دۆستایەتی کردنی موشریکان چاکسازی و سەلامەتی و تەندروستیە؟)

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ سَوَاءً ۖ فَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ أَوْلِيَاءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ۖ وَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا} [النساء : 89]

واتە: ئاواتەخوازن کە ئێوەش بێ باوەڕ بن وەک چۆن خۆیان بێ باوەڕ بوون، ئەو کاتە (هەردوولاتان) یەکسان دەبن لە بێ باوەڕیدا، کەواتە لەوانە پشتیوان و یاوەر مەگرن هەتا کۆچ دەکەن لەپێناوی الله، خۆ ئەگەر یاخی بوون و پشتیان تێکردن، ئێوە بیانگرن و بیانکوژن لە هەر کوێدا ئەوانەتان دەستکەوت، هەرگیز نەکەن ئەوانە بکەنە یاوەرو هاوکار..

جا الله تعالى هەواڵیداوە دەربارەی کافران کە: ئاواتەخوازن موسڵمانانیش کافرببنەوە وەك چۆن خۆیان کافربوون، ئینجا الله تعالى نەهی کردووە لەوەی کە ئەهلی ئیمان دۆستایەتیان بکەن تاکو ئەوکاتەی هیجرەت دەکەن دوای موسڵمان بوونیان.

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ ۙ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ إِن كُنتُمْ خَرَجْتُمْ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَابْتِغَاءَ مَرْضَاتِي ۚ تُسِرُّونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا أَخْفَيْتُمْ وَمَا أَعْلَنتُمْ ۚ وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ (1) إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً وَيَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ وَأَلْسِنَتَهُم بِالسُّوءِ وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ (2) لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ ۚ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَفْصِلُ بَيْنَكُمْ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (3) {قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ...} واته: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەنە دۆستی گیانی بەگیانی، لەکاتێکدا خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەردەبرن، بەڕاستی ئەوان بێ باوەڕیش بوون بەوەی لە لایەن الله بۆتان هاتووە، ئەوانە پێغەمبەرو ئێوەش دەردەکەن لە مەککە، لەبەر ئەوەی کە باوەڕ دەهێنن بە الله ـی پەروەردگارتان، ئەگەر ئێوە دەرچوون بۆ تێکۆشان لە پێناوی من و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی مندا، بەنهێنی خۆشەویستی خۆتانیان پێدەگەیەنن، لەکاتێکدا من ئاگادارم بەوەی شاردوتانەتەو و بەوەش کە ئاشکراتان کردووە، جا هەر کەس لە ئێوە کاری وابکات ئەوە بەڕاستی ڕێبازی ڕاستی ون کردووە.

هەر کاتێك کافران دەسەڵاتیان هەبێت و ئێوەیان دەست بکەوێت، ئەوە دەبنە دوژمنتان و دەست و زمانیان بەخراپە درێژ دەکەن بۆتان (بەهەرچی بۆیان بکرێت) ئەوانە پێیان خۆش بووە و ئاواتیان خواستووە کە ئێوە لە ئایینەکەتان هەڵگەڕێنەوە.

خزمان و ڕۆڵەکانتان هەرگیز فریاتان ناکەون، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا لە یەکتان جیادەکاتەوە، بەڕاستی الله بینایە بەو کارو کردەوەی کە دەیکەن.

ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی الله دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە الله ـی تاك و تەنها دەهێنن.

تا ئەو فەرموودەیەی کە فەرموویەتی: {إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ} [الممتحنة : 9]

واتە: بەڕاستی الله قەدەغەی ئەوەتان لێ دەکات کە پشتیوانیی بکەن لەوانەی کە جەنگیان بەرپا کرد دژی ئاین و دەریان کردن لە شوێنەواری خۆتان و پشتیوانی ئەوانیان کرد ڕۆڵیان هەبوو لە دەرکردنتاندا، ئەوەش پشتیوانیان لێ بکات و خۆشی بوێن، جا ئائەوانە هەر ستەمکارن.

[لەوێشەوە] تا ئەو ئایەتەی کە فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا مِنَ الْآخِرَةِ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ} [الممتحنة : 13]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پشت مەبەستن بەکەسانێك کە الله خەشمی لێگرتوون و دۆستایەتیان مەکەن، بێگومان ئەوانە نائومێد و بێ هیوا بوون لە پاداشتی قیامەت، هەروەکو کافران نائومێد بوون لە گەڕانەوەی نیشتەجێکانی گۆڕستان.

جا لە صەحیحەکاندا چەسپاوە کە ئەم فەرموودەیە لەسەر پیاوێك لە هاوەڵان دابەزیوە، کاتێك نامەی بۆ ئەهلی مەککە نوسی تا هەواڵیان پێبدات بەوەی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەچێت بەرەو ڕوویان لەساڵی فەتح، جا الله تعالى ئەم ئایەتانەی دابەزاندووە بە هەواڵدان سەبارەت بەو نامەیە، وە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ـی نارد (رضى الله عنه) بە شوێن ئەو ئافرەتەی کە نامەکەی هەڵگرتبوو، جا نامەکەی دۆزیەوە لەنێو قژی ئافرەتەکە بە لولدراوی، جا پیاوەکە هات بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بیانووی هێنایەوە و سوێندی دەخوارد کە گومانی نەبووە [ لە پێغەمبەرایەتی محمد(صلى الله عليه وسلم) ]، بەڵام کەسی نەبوو تاکو ماڵ و خێزانەکەی لە مەککە بپارێزێت

**ئەویش بەم شتە دەستێکی ویست لای قورەیش، وە هەندێ لە هاوەڵان مۆڵەتیان لە پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) وەرگرت بۆ کوشتنی، پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) فەرمووی: (جا تۆ چوزانی، لەوانەیە الله تعالى سەیری ئەهلی بەدری کردبێت و فەرموبێتی: هەرچی ویستتان بیکەن، بەڕاستی من لێتان خۆشبووم)**

**جا خۆ ئەگەر ئەو پیاوە لە ئەهلی بەدر نەبوایە ئەوە دەکوژرا بەهۆی ئەم نامەیە کە نووسیبووی.**

**جا لەم سورەتە لەگەڵ هۆکاری دابەزینەکەشی، چەندین بەڵگەی تێدایە لەسەر واجب بوونی دوژمنایەتی کردنی کافران و بڕینەوەی هەموو پەیوەندیەك لەگەڵیان، بەڵگەکانیش زۆرن: الله تعالى قەدەغەی کردووە لەوەی کە ئەهلی ئیمان دۆستایەتی دوژمنی الله دوژمنی خۆیان بکەن، کە ئەمەش جەختکردنەوەیە لەسەر دوژمنایەتی کردنیان، چونکە دوژمنایەتیکردنی دوژمنێك بۆ پەروەردگارت دەبێتە هۆی هێنان و بانگکردنت بەرەو دوژمنایەتی کردنی ئەو دوژمنە.**

**با ئێمەش لەسەر ئەم شتە نمونەیەك باس بکەین کە نمونە و ستایشی هەرە بەرز و بڵندیش تەنها بۆ الله ـیە، تۆ وا دابنێ خۆت بەندەی مرۆڤێکی کە ئەویش گەورەی تۆیە [واتە خاوەنی تۆیە]، وە هۆکارە بۆ دەستەبەر بوونی بەرژەوەندیەکانت و قەدەغەکردنی زیانەکان کە پێت بگەن، وە گەورەکەشت خەڵکانێکی تری دوژمنن، جا ئایا لای تۆ شتێکی ڕاست و دروستە و لە عەقڵی تۆدا شیاوە کە دوژمنی گەورەکەت بکەیت بە دۆستی خۆت ئەویش قەدەغەت نەکات لەو شتە؟ ئەی چۆن بێت ئەگەر توندترین نەهی و قەدەغەت لێبکات و لەسەر دۆستایەتیەکەشت سزات بدات، وە تورەیی خۆی بڕژێنێتە سەرت وە ئەوەشت پێ بگەیەنێت کە تۆ ڕقت لێیەتی، وە ئەوەشت لێ قەدەغە بکات کە لات خۆشەویستە؟! ئەی چۆن بێت ئەگەر ئەو دوژمنەی گەورەکەت دوژمنی تۆش بێت هەروەها؟**

**وە ئەگەر بیکەیتە دۆستی خۆت دوای ئەم هەموو شتە ئەوە بەڕاستی تۆ ستەمکار و نەفامی؟! ئینجا فەرموویەتی: {تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ} واتە: خۆشەویستی سۆزیان بۆ دەردەبڕن، کە ئەمەش بەسە بۆ بەتاڵکردنەوەی گومانی ئەو کەسانەی کە گومان فرێ دەدەن**

چونكە ئەوان ئەگەر ئینكاری دۆستایەتی كردنی موشریكان و دەربڕینی خۆشەویستیان لێ بكرێت بۆیان ئەوا دەڵێن: ئەم شتە لە ئێمەدا ڕوویندداوە، وە ئەوان لەگەڵ ئەوەشدا پشتیوانی ئەهلی ناحەق و باتڵ دەكەن بە ماڵ و سامانیان، وە بە زمانیان بەرگریان لێدەكەن، وە لەگەڵیان ڕێك دەكەون لەسەر دۆزینەوە و بەدەست خستنی عەورات و شەرمی موسڵمانان.

جا ئایا ئەمە لەكوێی ئەو كتێبەدایە كە ئەو سوڕەتەی تێدا دابەزیوە، لەكاتێكدا بەڕاستی الله تعالى ناوی لێناوە دەربڕینی سۆز و خۆشەویستی بۆیان؟! كە ئەمەش زۆر ڕوون و ئاشكرایە.

ئینجا فەرموویەتی: {وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ ۙ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ} واتە: بەڕاستی ئەوان بێ باوەڕیش بوون بەوەی لە لایەن الله بۆتان هاتووە، ئەوانە پێغەمبەرو ئێوەش دەردەكەن لە مەككە، لەبەر ئەوەی كە باوەڕ دەهێنن بە الله ـی پەروەردگارتان.

جا باسی ئەو شتەی كردووە كە دەبێتە بانگكەر و پاڵنەر بۆ دوژمنایەتی كردنیان، كە بریتیە لە كوفركردنیان بەو حەق و ڕاستیەی كە لەلایەن الله تعالى بۆمان هاتووە، وە دەكردنی پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) و ئەهلی ئیسلام[ لە مەككە ] بەهۆی باوەڕهێنانیان بە الله، ئینجا الله تعالى ئاگاداری داوە لەوەی كە دۆستایەتیان بكرێت بەوەی كە [الله تعالى] هەموو شتێكی نهێنی و ئاشكرا دەزانێت، كە ئەمەش هەڕەشەیەكی توندە.

ئینجا الله تعالى فەرموویەتی: {وَمَن يَفْعَلْهُ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ} [الممتحنة : 1] جا هەر كەس لە ئێوە كاری وابكات ئەوە بەڕاستی ڕێبازی ڕاستی ون كردووە(گومڕابووە).

واتە: هەركەسێ دۆستایەتی و موالاتی دوژمنانی الله بكات، وە سۆز و خۆشەویستیان بۆ دەرببڕێت، وە دڵخۆش بێت لەگەڵیان، ئەوا لەڕێگای ڕاست لایداوە، وە لەڕێبازی ڕاستەقینە دەرچووە.

ئینجا فەرموویەتی: {إِن يَثْقَفُوكُمْ يَكُونُوا لَكُمْ أَعْدَاءً} هەر كاتێك بێ باوەڕان دەسەڵاتیان هەبێت و ئێوەیان دەست بكەوێت، ئەوە دەبنە دوژمنتان.

**جا ڕوونی کردۆتەوە کە ئەوان ئەگەر توانایان بەسەر موسڵماندا شکا و دەستیان زاڵ بوو بەسەریدا ئەوا بەخراپی ئەشکەنجەی دەدەن، وە دەست و زمانیان بۆیان درێژ دەکەن بە لێدان یان کوشتن یان قسەی توند و نابەجێ، وە ئەگەر دۆستایەتیان بکات و ڕێککەوتن و پەیوەندی هەبێت لەگەڵیان لەحاڵەتی دووربوون لێیان ئەوە هێشتاش لێی ڕازی نابن و پارێزراوی ناکەن لە شەڕ و خراپەی خۆیان، تا ئەوکاتەی دینەکەی دەبێتە دینی ئەوان، بۆیەش الله تعالی فەرموویەتی: {وَوَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ} واتە: ئەوانە پێیان خۆش بووە و ئاواتیان خواستووە کە ئێوە لە ئایینەکەتان هەڵگەڕێنەوە.**

**وە هەروەك فەرموویەتی: {وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ} [البقرة : 120] واتە: هەرگیز جولەکە و گاورەکان لە تۆ (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم)، ئەی ئیماندار) ڕازی نابن، هەتا بە تەواوی شوێن ئاین و بەرنامەیان نەکەویت.**

**ئینجا فەرموویەتی: {لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ ۚ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} واتە: خزمان و ڕۆڵەکانتان هەرگیز فریاتان ناکەون لەقیامەتدا.**

**جا ڕوونی کردۆتەوە ئەگەر پیاو منداڵ و خزمی هەبێت لەنێو موشریکان هێشتا بۆی حەڵاڵ نیە دۆستایەتیان بکات، هەروەك ئەو پیاوەی کە عوزر و بیانووی بەوە هێنایەوە کە لە مەککە منداڵ و خزمی هەیە، جا الله تعالی هیچ عوزرێکی بۆ نەهێنایەوە، چونکە واجبە لەسەر مرۆڤ کە الله و پێغەمبەرەکەی لەلای خۆشەویستتر بن لە هەموو کەسێکی تر، وە ئیمان و باوەڕ وەدەست نایەت تا ئەوکاتەی لەلای مرۆڤ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە هەموو شتێك خۆشەویستتر دەبێت لە منداڵەکان و لەباوان و لەهەموو خەڵکی.**

**جا فەرموودەی الله تعالی کە فەرموویەتی: {لَن تَنفَعَكُمْ أَرْحَامُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ ۚ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} خزمان و ڕۆڵەکانتان هەرگیز فریاتان ناکەون لەقیامەتدا.**

**واتە: لە سزای الله ڕزگارتان ناکەن، ئەی کەوایە چۆن بەسەر ویست و فەرمانی الله پێشیان دەخەن، وەلەپێناویاندا دۆستایەتی دوژمنانی الله دەکەن، لەکاتێکدا الله تعالی سەیرتان دەکات، بینایە بە وتە و کردەوە و نیەتەکانتان؟**

ئینجا ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو شتەی جەختی لەسەر کردۆتەوە لە دۆستایەتی کردنی ئیمانداران، وە نەهی لێیان کردووە لەدۆستایەتی کردنی کافران، ئەمە فەرمانێك نیە تەنها بۆ ئەوان بێت، بەڵکو ئەوە ڕێگای ڕاستە و (صراط المستقیم) ـە کە هەموو پێغەمبەران لەسەری ڕۆیشتوون، جا فەرموویەتی: {قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ} بەڕاستی نمونە و سەرمەشقێکی چاك هەیە بۆتان لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدابوون، واتە: پێغەمبەران.

{إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ} کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی الله دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە الله ـی تاك و تەنها دەهێنن.

جا وتەی الله تعالی کە فەرموویەتی: {قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ} بەڕاستی نمونە و سەرمەشقێکی چاك هەیە بۆتان، هەروەك ئەو ئایەتە وایە کە تیایدا فەرموویەتی: {ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا} [النحل : 123] واتە: ئینجا وەحیمان بۆ تۆ نارد و فەرمانمان پێکردیت کە شوێن دین و میللەتی ئیبراهیم بکەویت کە دوور بووە لە هەموو ڕێگایەکی چەوت و پوچ.

جا الله سبحانە تعالی فەرمانی پێکردووین کە سەرمەشق و نمونە لە ئیبراهیمی حەنیف وەرگرین وە ئەوانەش کە لەگەڵیدابوون لە پێغەمبەران، ئەمەش لە وتەکەیاندا: {إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ} واتە: ئێمە بەریئین لە ئێوە، تاکۆتایی ئایەتەکە.

جا ئەگەر واجب لەسەر موسڵمان کە ئەو شتە بەو قەومە بڵێت کە لە دەوروبەری خۆیدان، ئەوا هەر لەخۆیدا واجبە بەرامبەر ئەو کافرانەی کە لێیەوە دوورترن و پێچەوانەی ئەون لەچەندەها شتی ڕوون و ڕەوان.

وە لێرەدا سەرنج و [بیرکردنەوە]ـەکی گرنگ و ڕۆشن هەیە لە فەرموودەی الله تعالی: {إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ} واتە: ئێمە بەریئین لە ئێوە و ئەو شتانەش کە لەجیاتی الله دەیپەرستن.

ئەویش ئەوەیە کە الله تعالی بەڕائەت لە موشریکان ئەوانەی کە غەیری الله دەپەرستن پێشی خستووە بەسەر بەڕائەت لە بت و پەرستراوەکان ئەوانەی لەجیاتی الله دەپەرسترێن، لەبەر ئەوەی یەکەم گرنگترە لە دووەم.

چونکە لەوانەیە بەڕائەت لە بت و پەرستراوەکان بکات بەڵام بەڕائەت لەوانە نەکات کە دەیپەرستن، جا لەمەشدا ئەو شتەی بەجێنەهێناوە کە واجبە لەسەری، ئەما ئەگەر بەڕائەتی کرد لە موشریکان ئەوا ئەو شتە ئیلزام و پێویستی بەوە دەکات کە بەڕائەت بکرێت لە پەرستراوەکانیشیان

ئەمەش هەروەك وتەی الله تعالی وایە کە فەرموویەتی: {وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَأَدْعُو رَبِّي عَسَىٰ أَلَّا أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيًّا} [مريم : 48] واتە: وا من دوور دەکەومەوە و کەنارگیری دەکەم، لە ئێوە و لەو شتانەی کە لەجیاتی الله دەیپەرستن، من تەنها هاناو هاوار بۆ پەروەردگارم دەبەم و هەر ئەو دەپەرستم، ئومێدەوارم کە پەروەردگارم نائومێد و ڕەنجەڕۆم نەکات و دوعاو نزاو پەرستنم لێ وەربگرێت.

جا لێرەدا کەنارگیری و جیابوونەوە لەوانی پێشخستووە بەسەر جیابوونەوە لە پەرستراوەکانیان، بە هەمان شێوە وتەی الله تعالی: {فَلَمَّا اعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ} واتە: جا کاتێک ئیبراهیم ڕۆیشت و دوور کەوتەوە لەو خەڵکە گومڕایە و لەو شتانەی کە لە جیاتی الله دەیانپەرست.

هەروەها: {وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ} واتە: (هەندێکیان وتیان) جا ئێستە کە ئێوە بڕیارتانداوە خۆتان دوورە پەرێزبگرن لەم خەڵکەو لەوشتانە کە لە جیاتی الله دەیانپەرستن.

بۆیە پێویستە لەسەرت کە ئەم سەرنجە بزانیت چونکە دەرگای دوژمنایەتی کردنی دوژمنانی الله دەکاتەوە بۆت، چونکە چەند مرۆڤ هەیە شیرك و هاوەڵ بڕیار نادات، بەڵام دوژمنایەتی ئەهلەکەی ناکات، جا بەم شتە نابێتە موسڵمان، چونکە دینی هەموو پێغەمبەرانی جێهێشتووە.

ئینجا فەرموویەتی: {كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا} واتە: کوفرمان کرد پێتان وە دوژمنایەتی و ڕق و قین بەرپابوو لەنێوانمان تاهەتایی.

{وَبَدَا} واتە: دەرکەوت و ئاشکرابوو، وە سەرنجی پێشخستنی دەژمنایەتی بدە بەسەر ڕق و قین،

چونکە یەکەم گرنگترە لە دووەم، چونکە مرۆڤ لەوانەیە ڕقی لە موشریکان بێت بەڵام دوژمنایەتیان نەکات، جا واجبی سەرشانی خۆی بەجێنەهێناوە تا ئەوکاتەی دوژمنایەتی و ڕق و قین لێی دێتە جێ، وە بەهەمان شێوە هەردەبێت دوژمنایەتی و ڕق و قین ئاشکرا بن: واتە ڕوون و دەرکەوتوو بن.

وە بزانە کە ڕق و قین ئەگەرچی پەیوەندی بە دڵەوە هەیە، بەڵام هیچ سودێك ناگەیەنێت تا ئەوکاتەی کاریگەریەکانی دەردەکەون و نیشانەکانی ئاشکرا دەبن، وە ئەمەش نابێت تا ئەوکاتەی کە دەبەسترێتەوە بە دوژمنایەتی و پەیوەندی بڕین[لەگەڵ موشریکان]

جا لەوکاتەدا دوژمنایەتی و ڕق و قین ئاشکرا دەبن، ئەما ئەگەر دۆستایەتی و پەیوەندی هەبێت ئەوا ئەمە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ڕق و قین، جا پێویستە لەسەرت کە ورد ببیتەوە لەم بابەتە چونکە گومان و شوبهەی زۆرت لێ لادەبات.

ئینجا فەرموویەتی: {إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَىٰ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ} [الممتحنة : 9]

واتە: بەڕاستی الله قەدەغەی ئەوەتان لێ دەکات کە پشتیوانی بکەن لەوانەی کە جەنگیان بەرپا کرد دژی ئاین و دەریان کردن لە شوێنەواری خۆتان و پشتیوانی ئەوانیان کرد ڕۆڵیان هەبوو لە دەرکردنتاندا، ئەوەش پشتیوانیان لێ بکات و خۆشی بوێن، جا ئائەوانە هەر ستەمکارن.

جا لێرەدا الله تعالی چەند کردەوەیەکی باسکرد کە بانگ دەکەن بۆ پەیوەندی بڕینەوە لەگەڵیان و وازهێنان لە دۆستایەتی کردنیان، ئەوانیش: ئەوەیە کە ئەوان لەسەر دین شەڕتان لەگەڵ دەکەن، واتە لەپێناویدا، واتە ئەوەی کە وای لێکردن بجەنگن لەدژتان لەبەر ئەو دینەیە کە ئێوە لەسەریدان بەهۆی دوژمنایەتیان بۆ ئەو دینە، وە هەروەها ئیمانداران دەردەکەن لە خاکەکەیان، وە یارمەتی و پشتیوانی یەکتر دەکەن لەسەر دەرکردنیان، جا هەرکەسێ لەگەڵ ئەمەش دۆستایەتیان بکات ئەوا ئەو کەسە ستەمکارترینی ستەمکارانە.

وە لەو ئایەتەدا: گەورەترین دەلیل و ڕوونترین بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە دۆستایەتی کردنیان پێچەوانەی ئیمانە(ئیمان ناهێڵێت)، ئەمیش ئەوەیە کە الله تعالی فەرموویەتی: {إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ}

**جا کۆکردنەوە و جەمعی کردووە لەنێوان دەربڕینی {إِنَّمَا} کە ئاماژە بە جەختکردنەوە دەکات، وە لەگەڵ قەدەغەکردن و نەهی ئاشکرا، وە سێ خەسڵەتەکەی باسکردووە، وە جێناوی جەختکردنەوە(الحصر) بریتیە لە جێناوی (هُم) ئینجا باسی زوڵم و ستەمی کردووە کە ناساندوویەتی بە ئامرازی ناسراو.**

**ئینجا فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا مِنَ الْآخِرَةِ كَمَا يَئِسَ الْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَابِ الْقُبُورِ} واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پشت مەبەستن بەکەسانێك الله خەشمی لێگرتوون و دۆستایەتیان مەکەن، بێگومان ئەوانە نائومێد و بێ هیوا بوون لە پاداشتی قیامەت، هەروەکو کافران نائومێد بوون لە گەڕانەی نیشتەجێکانی گۆڕستان.**

**الله تعالی نەهی کردووە لە ئەهلی ئیمان لەوەی دۆستایەتی ئەو کەسانە بکەن کە الله لێیان توڕە بووە، جا دروست نیە بۆ ئیماندار وە شتێکی چاك نیە کە دۆستایەتی کەسانێك بکات کە شتێك بکات الله پێی توڕە ببێت لەئەنجامدانی کوفر، چونکە دۆستایەتی کردنی بۆی دەبێتەهۆی نەمانی ئیمان بە الله تعالی**

## بەشێك

## وە لێرەدا هەندێ بابەت هەیە کە پێویستە ئاگادارکردنەوەی لەبارەوە بدرێت، وە دەبێت گرنگی پێبدرێت، بۆ ئەوەی ئەنجامدەری ئەو شتانە بە تەواوی خۆی لە دینی موشریکان بەدوور بگرێت

**بابەتی یەکەم: وازهێنان لە شوێنکەوتنی ئارەزووەکانیان**

وە بەڕاستی الله تعالى نەهی کردووە لەوەی شوێنی بکەون، فەرموویەتی: {وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ} [البقرة : 120]

واتە: هەرگیز جولەکە و گاورەکان لە تۆ (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم)، ئەی ئیماندار) ڕازی نابن، هەتا بە تەواوی شوێن ئاین و بەرنامەیان نەکەویت، پێیان بڵێ: بەڕاستی هەر بەرنامەی الله (ئاینی ئیسلام، شایستەی ئەوەیە کە هەموولایەکمان شوێنی بکەوین) هیدایەتی ڕاست و دروست هەر لای ئەوە، خۆ ئەگەر شوێن ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت پاش ئەوەی زانیاری و زانستیت پێگەیشتووە، ئەوە بزانە کە لە لایەن الله هیچ سەرپەرشتیاری و یارمەتیەکت دەست ناکەوێت.

شێخی ئیسلام فەرموویەتی: سەرنج بدە چۆن لە هەواڵەکەدا فەرموویەتی: {مِلَّتَهُمْ} [واتە دین و بەرنامەکەیان]، وە لە نەهیکردن و قەدەغە فەرموویەتی: {أَهْوَاءَهُم} [واتە ئارەزووەکانیان]، چونکە گەلەکە ڕازی نابن تەنها بە شوێنکەوتنی دینەکەیان نەبێت بە موتڵەقی(یەکسەری)، وە لێرەدا قەدەغەکردنەکە لەسەر شوێنکەوتنی ئارەزووەکانیان هاتووە جا [ئارەزووەکە] کەم بێت یان زۆر.

هەروەها الله تعالى بە موسا و هارونی فەرمووە: {فَاسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ}

واتە: بەڵام ئێوە هەر بەردەوام بن لەسەر ڕێبازی ڕاست و دروستی هیدایەت و شوێن ڕێبازی ئەوانە مەکەون کە حەق نازانن و نافامن.

هەروەها موسا بەبراکەی خۆی هارونی فەرموو: {اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي وَأَصْلِحْ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ الْمُفْسِدِينَ} [الأعراف : 142]

واتە: ئیتر تۆ لە جیاتی من بە لەناو قەوم و عەشرەتمدا دەوری چاکسازی ببینە و نەکەیت شوێن ڕێبازی ئەوانە بکەویت کە چێنەری تۆوی خراپەن.

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا} [النساء : 115]

واتە: ئەوەش دوژمنایەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکات و لێی جیابێتەوە لە دوای ئەوەی ڕێگەی ڕاست و دروستی بۆ ڕوون بۆتەوە و ڕێبازێک بگرێتەبەر کە جیابێت لە ڕێگەو ڕێبازی ئیمانداران، ئەوە ڕووی وەردەچەرخێنین بۆ ئەو ڕووگەو بەرنامەیەی هەڵی بژاردووەو ڕووی تێکردووە، (لە قیامەتیشدا) دەیخاتە ناو دۆزەخەوە و دەیسوتێنین کە ئەویش سەرئەنجامێکی زۆر ناخۆش و سامناکە.

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ} واتە: ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا (کاتێک خاوەنانی کتێب لە گاورو جوو گیروگرفتیان دەهێنن بۆ لای تۆ) بەو بەرنامەیەی الله ناردوویەتی داوەریی بکە لە نێوانیانداو شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوەو لەو حەقە لامەدە کە بۆت ڕەوانە کراوە.

تا ئەو جێگەیەی ئایەتی دواتر کە فەرموویەتی: {وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ} واتە: شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە، وریابە نەوەکو ئەوان ڕێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێک لەو ڕێنموویيانەی کە الله بۆی ناردوویت.

وە الله تعالى فەرموویەتی: {وَلَقَدْ آتَيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ (16) وَآتَيْنَاهُم بَيِّنَاتٍ مِّنَ الْأَمْرِ ۖ فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ (17) ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ (18) إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ۚ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۖ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ} [الجاثية : 16-19]

واتە: سوێند بە الله بێگومان ئێمە تەوراتمان بەخشی بە نەوەی ئیسرائیل هاوڕێ لەگەڵ دەسەڵاتداری بۆ چارەسەرکردنی کێشەی خەڵکی، لەگەڵ پێغەمبەرایەتیشدا لە چەندەها ڕزق و ڕۆزی چاك و پاکیش بەهەروەرمان کردن، زیادە ڕێزیشمان دان بەسەر هەموو خەڵکی سەردەمی خۆیاندا.

هەروەها ئێمە چارەسەری هەموو کارێکی گرنگمان بۆ ڕوونکردنەوە و پێمان بەخشین (دەربارەی عەقیدەو شەریعەت و حەڵاڵ و حەرام)، جا ناکۆکی و دووبەرەکیان لە نێواندا بەرپا نەبوو مەگەر دوای ئەوەی کە هەموو شت ڕوون بۆوە و زانستیان بۆ هات، ئەوەش بەهۆی ستەم و ناکۆکی و حەسوودی نێوان خۆیانەوە، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەی محمد صلى الله عليه وسلم لە ڕۆژی قیامەتدا داوەری دەکات لە نێوانیاندا دەربارەی ئەو شتانەی کە ناکۆکیان لەسەری هەیە و ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی.

لەوەودوا ئێمە تۆمان ئەی محمد صلى الله عليه وسلم خستۆتە سەر بەرنامەیەکی ڕاست و ڕەوان لە هەموو کارو بارێکی ئەم ئاینەدا، کەواتە شوێنی بکەوە و لێی لامەدە، نەکەی شوێنی هەواو ئارەزووی ئەوان بکەویت کە نازانن و نافامن.

بێگومان ئەوانە هیچ کات فریات ناکەون و لەدەستی الله ڕزگارت ناکەن (ئەگەر الله لەخۆت برەنجێنیت و نافەرمانی بکەیت)، بەڕاستی ستەم کاران یار و یاوەری هەندێکیانن، وە الله پشت و پەنای دیندارو چاکانە.

شێخی ئیسلام فەرموویەتی: جا الله سبحانه وتعالی هەواڵی پێداوین کە نیعمەتی ڕژاند بەسەر بەنی ئیسرائیل بە نیعمەتی دین و دونیا، وە ئەوان توشی ڕاجیایی و پەرتەوازەیی بوون دوای هاتنی عیلم و زانست ئەمەش بەهۆی ستەم و ناکۆکی و حەسودی هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریان، ئینجا محمد(صلی الله علیه وسلم) ـی نارد لەسەر شەریعەتێك کە بۆی ناردو فەرمانی پێکرد شوێنی بکەوێت، وە نەهی لێکرد لەوەی شوێن ئارەزووی ئەو کەسانە بکەوێت کە نەزان و کاڵفامن، وە لەوانەش کە نازانن و کاڵفامن هەرکەسێك دەگرێتەوە کە: پێچەوانەی شەریعەتەکەی کردبێت، وە ئارەزووەکانیان: ئەو شتانەی کە ئارەزوویان لێیەتی.

وتم: جا ئەگەر شوێنکەوتنی ئارەزووەکانی هەموو کافران و هەڵسوکەوتیان و ئەوەش کە خۆشیاندەوێت نەهی لێکرابێت و قەدەغە بێت، جا هەر ئەمەیە کە داواکراوە، ئەمەش تەنها لەترسی شوێنکەوتنیان بۆ ئەسڵ و بنچینەی دینە پوچەڵەکەیان.

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ۚ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَمَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ} [الرعد : 37] واتە: هەر بەو شێوەیە (پێشتر کتێبی ئاسمانیمان بە زمانی جۆراو جۆر ڕەوانە کردووە) قورئانمان وەکو داوەرێك بەعەرەبیەکی پاراو دابەزاندووە، سوێند بەالله ئەگەر شوێنی ئارەزووەکانی ئەوان بکەویت، دوای ئەوەی زانستی و زانیاری تەواوت (لەلایەن الله) بۆ هات، ئەوە هیچ پشتیوان و پارێزەرێکت نییە لە سزای الله بتپارێزێت.

جا الله تعالی هەواڵیداوە کە: کتێبەکەی دابەزاندووە بە داوەریی و بە زمانی عەرەبی، ئینجا هەڕەشە و ئاگاداری پێداوە لە شوێنکەوتنی ئارەزووەکانی کافران بەو هەڕەشە توندە.

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ} [الأنعام : 150]

واتە: وە شوێنی ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە باوەڕیان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەکردووە و شوێن ئارەزووی ئەوانەش مەکەوە کە باوەڕ بەرۆژی دوایی ناهێنن و ئەوانەش کە هاوتا بۆ پەروەردگاریان دادەنێن.

وە چەندەها ئایەتی تری لەم جۆرە کە بەڵگەن لەسەر واجب بوونی وازهێنان لە شوێنکەوتنی ئارەزووەکانی کافران، وە حەڕامبوونی شوێنکەوتنی، وە هەروەها بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو شتە یەکێکە لە گەورەترین دەرد و کارەساتەکان لە دین.

**فەرمانی دووەم: سەرپێچی کردنیان لەو شتانەی کە فەرمانیان پێکردووە**

چونکە الله تعالی نەهی کردووە لە گوێڕایەڵی کردنی کافران، وە هەواڵیداوە کە ئەگەر موسڵمانان گوێڕایەڵیان بکەن ئەوا لە ئیمان هەڵیاندەگەڕێننەوە بەرەو کوفر و خەسارتمەندی، جا الله تعالی فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ} [آل عمران : 149]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەوانە بن کە کافر و بێ دینن، ئەوە بەرەودوا دەتانگێڕنەوە و پاشگەزتان دەکەنەوە و لە دین وەرتاندەگێڕن، ئەوسا ئیتر بە دۆڕاوی دەگەڕێنەوە.

هەروەها فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا فَرِيقًا مِّنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ} [آل عمران : 100]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر گوێڕایەڵی هەندێک لەوانە ببن کە کتێبی (ئاسمانییان) پێدراوە، دوای ئەوەی کە ئێوە باوەڕتان هێناوە، دەتانگێڕنەوە سەر ڕێبازی کوفرو بێ باوەڕی.

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا} [الكهف : 28]

واتە: گوێڕایەڵی ئەوجۆرە کەسە مەکە کە دڵیمان غافڵ کردووە لە یادی خۆمان (بەهۆی دنیاپەرستیەوە) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووەو هەرچی کاروباری هەیە بێ سەرو بنەو لە سنوور دەرچووە.

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ} [الأنعام : 121]

واته: دڵنیابن کە شەیتانەکان شت دەخەنە دڵی لایەنگرەکانیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بکەن و (بەرگری لە بەتاڵیان بکەن) جا ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداری ئەو هاوەڵگەرو شەیتانانە بن، ئەوە بێگومان مانای وایە ئێوەش موشریک و هاوەڵگەرن.

وە فەرموویەتی: {وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ} [الأنعام : 116]

واتە: خۆ ئەگەر فەرمانبەردارو ملکەچی زۆربەی خەڵکی سەرزەوی بیت ئەوە لە ڕێبازی الله وێڵت دەکەن، چونکە شوێنی هیچ شتێک ناکەون جگە لە گومان و تەنها گۆترەکاری دەکەن.

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا (51) فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا} [الفرقان : 51-52]

واتە: خۆ ئەگەر بمانویستایە بۆ هەر شارو شارۆچکەیەک پێغەمبەرێک و یادخەرەوەیەکمان ڕەوانە دەکرد.

(تۆ ئەی پێغەمبەر بەردەوام بە لەسەر گەیاندنی پەیامەکەت) و بە گوێی بێ باوەڕان مەکە و ملکەچیان مەبە و بەم قورئانە هەوڵ و کۆشش و خەباتێکی گەورەیان لەگەڵدا بکە.

هەروەها فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا} [الأحزاب : 1]

واتە: ئەی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لە الله بترسەو بەردەوام بەلەسەر تەقواو پارێزکاری، هەرگیز ملکەچی بێ باوەڕان و دووڕووەکان مەبە (کەدەیانەوێت لەڕێگەی ڕاست وێڵت بکەن، چونکە) بەڕاستی الله هەمیشە و بەردەوام زاناو دانایە.

هەروەها الله تعالی هەواڵدەدات دەربارەی ئەوانەی کە گوێڕایەڵی سەرانی کوفریان کردووە فەرموویەتی: {وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا} [الأحزاب : 67]

واتە: (هەروەها) دەڵێن: ئێمە ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاغاو گەورەکانمان بووین، هەر ئەوان ڕێگەو ڕێبازی (ڕاستیان) لە ئێمە شێوان و ون کرد.

هەروەها فەرموویەتی: {اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ} [التوبة : 31]

واتە: (گاورو جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی الله (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن) هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش (بەکوڕی الله دەزانن) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە پەرستراوێك، بێگومان جگە لەوزاتە پەروەردگارێکی تر نیە، پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەیە، کە (ئەو نەفامانە) هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن.

وە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بە کردنی حاخام و قەشەکان بە پەرستراو تەفسیری کردووە بە: گوێڕایەڵی کردنیان لە حەڕامکردنی حەڵاڵ و حەڵاڵکردنی حەڕام.

جا ئەگەر کەسێك لەم شتەدا هەڵسێ بە گوێڕایەڵی کردنی ئەحبارەکان - کە زاناکانن - وە ڕوهبانەکان - ئەوانەن کە پەرستش و عیبادەتی زۆر دەکەن -، ئەوا کردوونیەتی بەپەرستراوی خۆی لەجیاتی الله، جا هەرکەسێ گوێڕایەڵی کەسانی نەفام و خراپەکار(جاهیل و فاسقەکان) بکات لە حەڕامکردنی ئەو شتانەی کە الله حەڵاڵی کردووە یان حەڵاڵکردنی ئەو شتانەی کە الله حەڕامی کردووە ئەوا بەڕاستی ئەوانی کردووە بە پەرستراوی خۆی لەجیاتی الله، بەڵکو ئەمە ئەولاترو لەپێشترە.

فەرمانی سێیەم: وازهێنان لە مەیلکردن بەلای کافرە ستەمکارەکان

وەبەڕاستی الله تعالى نەهی کردووە لەمە، فەرموویەتی: {وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ} [هود : 113]

واتە: نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدا بێت کە ستەمیان کردووە و لەخوا یاخی بوون، چونکە ئەو کاتە ئاگر دەتانسوتێنێت، کەسیش جگە لە خوا پشتیوانتان نابێت، لەوەودوایش یارمەتی نادرێن.

جا الله تعالى نەهی کردووە لەوەی مەیل بکرێتەوە بەلای ستەمکاران، وە پەیمانی داوە کە بەو شتە ئاگر خاوەنەکەی دەسوتێنێت و پشتیوانیشی ناکرێت، وە شیرك بریتیە لە گەورەترین جۆرەکانی ستەم(زوڵم)، هەروەك الله تعالى فەرموویەتی: {إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ} [لقمان : 13]

واته: بەڕاستی هاوتاو هاوبەش بڕیاردان(شیرك) ستەمێکی زۆر گەورە و ناڕەوایە.
جا هەرکەسێك بداتەوە بەلای ئەهلی شیرك واتە: مەیل بکاتەوە بەلایاندا یان بە شتێك لە کردەوەکانیان ڕازی بێت، ئەوا شایانی ئەوەیە کە الله - سبحانه تعالی - بە ئاگر سزای بدات، وە پشتی بەربدات لەدونیا و ئاخیرەت.
هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {وَلَوْلَا أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلًا (74) إِذًا لَّأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا} [الإسراء : 74-75]
واته: خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان پایەدارو دامەزراو نەکردایە، ئەوە بەڕاستی نزیك بوویت (بەمەزەندەی خۆت، بۆ بەرژەوەندیی بانگەوازەکەت) کەمێك بە لایاندا مەیل بکەیت و بەدڵی ئەوان بکەیت!!
ئەو کاتە ئیتر دوو بەرامبەری (هاوەڵگەران) لە دنیاداو بە دوو بەرامبەری ئەوان لە دوای مردن سزاو ئازارمان پێ دەچەشتیت، پاشان کەسیشت دەست نەدەکەوت فریات بکەوێت و لەدەستی ئێمە ڕزگارت بکات.
جا الله تعالی هەواڵیداوە کە ئەگەر دامەزراندن و پێچەسپاندنی بۆ پێغەمبەرەکەی - صلی الله علیه وسلم - نەبوایە، ئەوا کەمێك بەلای موشریکاندا مەیلی دەکردەوە، وە ئەگەر مەیلی بکردایە بەلایاندا ئەوە سزای دونیا و سزای قیامەتی دەچەشت بە چەند ئەوەندە.
بەڵام الله تعالی جێگیری کرد و مەیلی نەکردەوە بەلایان، بەڵکو دوژمنایەتی کردن دەستی خۆی بڕیەوە لێیان.
بەڵام ئەگەر قسەکردنەکە بۆ پێغەمبەربێت(صلی الله علیه وسلم) سەرەڕای پارێزراویەکەشی لەتاوان(العصمة) ئەوا کەسانی تر غەیری ئەو ئەولاترن کە ئەم هەڕەشەیە بیانگرێتەوە.
فەرمانی چوارەم: وازهێنان لە سۆز و خۆشەویستی دەربڕین بۆ دوژمنانی الله
الله تعالی فەرموویەتی: {لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ}

**واتە: کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە الله و بە ڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کە دژایەتی الله و پێغەمبەرەکەیان کردبێت، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باوو باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن.**

**شێخی ئیسلام فەرموویەتی: جا الله - سبحانه وتعالى - هەواڵیداوە کە هیچ ئیماندارێك نیە کافرێکی خۆش بوێت، جا هەرکەسێ یۆز دەربڕێت بۆ کافران(خۆشی بوێن) ئەوا ئیماندار نیە. اهـ.**

**گوتم - شێخ حەمەد - : جا ئەگەر الله تعالى نەفی ئیمانی کردبێت(ڕەتی کردبێتەوە) لە کەسێك کە باوك و براو عەشیرەتی خۆی خۆشبوێت(سۆزیان بۆ دەربڕێت) ئەگەر ئەوان دوژمنایەتی الله و پێغەمبەرەکەی بکەن، ئەوا هەرکەسێ سۆز و خۆشەویستی بۆ کافرانێك دەربڕێت کە دوورتر بن لێی ئەوا ئەو کەسە ئەولاترە بەوەی کە بێ ئیمان بێت.**

**فەرمانی پێنجەم: وازهێنان لە خۆچواندن بە کافران لە کاروکردەوە ئاشکرا و دیارەکان.**

**چونکە جۆرێك لە خۆشەویستی و سۆز و دۆستایەتی ناخ دەهێنێت لەگەڵ خۆی، بەهەمان شێوە خۆشەویستی لەناخ و دڵ خۆچواندن لەئاشکرا لەگەڵ خۆی دەهێنێت.**

**ئەمەش شتێکە کە هەست و تاقیکردنەوە شایەتی بۆ دەدات، تەنانەت دوو پیاو ئەگەر خەڵکی یەك وڵات بن ئینجا بەیەکەوە لە وڵاتێکی نامۆ(غوربەت) کۆببنەوە، ئەوا لەنێوانیاندا خۆشەویستی و سۆز دەبێتە شتێکی گەورە و گرنگ، ئەگەرچی لە شارەکەی خۆیان یەکتریشیان نەناسیبێت، یاخود پەیوەندیان لەگەڵ یەکتر نەبووبێت یان پەیوەندیان بڕیبێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە هاوبەشی جۆرە وەسف و شێوەیەکە هەردووکیان پێیەوە تایبەتمەند بوون لە وڵاتی غوربەت و نامۆیی، بەڵکو ئەگەر دوو پیاو کۆببنەوە لە سەفەرێك یاخود لە وڵاتێکی نامۆ ئەوا هاوشێوەیی و لەیەك چوونیان دەبێت لە عەمامە یان جلوبەرگەکانیان، یان لە سەرو قژ یان لە شێوازی خۆڕێکخستن، وە شتی لەم شێوەیە، ئەوا لەوکات خۆشەویستی دەبێت لەنێوانیاندا زیاتر لەوەی کە هەیە لەنێوان ئەم و ئەوانی تردا، بەهەمان شێوە سەرانی شتە دروستکراوە دونیاییەکان دەبینیت، هەندێکیان دەبنە دۆست و خۆشەویستی هەندێکی تریان بەشێوازێك کە لەگەڵ خەڵکی تر وانین، تائەوەی کە ئەم شتە لەنێو دوژمنایەتی و شەڕکردنیشدا دەبێت**

یان لەسەر موڵك، یان ئەوەتا لەسەر دین، وە دەبینیت پادشاکان و سەرکردەکانیش، ئەگەرچی خاك و شانشینەکانیان دوور بن لەیەکەوە بەڵام لەنێوانیاندا گونجانێك هەیە کە لەیەکچوون پاراستنی هەندێکیان بۆ هەندێکی لەگەڵ خۆی دەهێنێت، ئەمەش هەمووی لە سروشتەوە دێت و سروشتی [مرۆڤ] بەم شێوەیەی دەوێت، مەگەر دین یاخود مەبەستێکی تایبەت لەو شتە قەدەغەی بکات.

جا ئەگەر لەیەکچوون [خۆچواندن] لە کاروبارەکانی دونیا ببێتە هۆی خۆشەویستی و دۆستایەتی بۆیان، ئەی چی دەربارەی خۆچواندن لە کاروبارە دینیەکان؟! چونکە بەڕاستی بردنی [کەسەکە] بەرەو شێوازێك لە دۆستایەتی و موالاة [لە دین] زیاتر و توندترە، ئەمەی وتەی شێخی ئیسلامە ابن تیمیة رحمه الله.

وتم: جا ئەگەر خۆچواندن بەکافران لەکاروباری ئاشکرا، ئەمە نەهی لێکراوە چونکە وەسیلەیە و هۆکارێکە خاوەنەکەی دەبات بەرەو دۆستایەتی کردنیان و خۆشویستنیان، جا بەڕاستی نەهی کردن لەم ئامانج و ئەو شتە کە ئاگاداری لەسەر دراوە توندتر و سەختترە، وە قەدەغەکردن لێی وە حەڕامکردنی زیاتر جەختی لەسەر کراوەتەوە، وە هەر ئەمەشە کە داواکراوە.

## باسکردنی هەندێك بەڵگە لەسەر قەدەغەکردنی خۆچواندن بە کافران و موشریکان:

پێشەوا ئەبو داود لە سونەنی خۆی لە ابن عمر ڕیوایەتی کردووە، فەرموویەتی: نێردراوی الله(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (مَن تَشَبَّه بقومٍ فهو منهم) واتە: هەرکەسێ خۆی بە گەلێك بچوێنێت ئەوا لەوانە[حیسابی ئەوانی بۆ دەکرێت].

شێخی ئیسلام فەرموویەتی: ئیسنادەکەی چاکە(وإسناده جيد)، وە کەمترین حاڵەتی ئەوەیە کە حەڕامبوونی خۆچواندن [بە موشریکان] پێویست دەکات، ئەگەرچی لەڕووکەشدا دەچێتەوە سەر کوفری ئەو کەسەی کە خۆی چواندووە پێیان، هەروەك لە فەرموودەی الله تعالى هاتووە: {وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ}.

وە ئەمەش هاوشێوەیە لەگەڵ ئەو ڕیوایەتەی کە دواتر باسی دەکەین لە عبدالله ـی کوڕی عەمرو، کە فەرموویەتی: (من بنى بأرض المشركين، وصنع نيروزهم ومهرجانهم، وتشبه بهم حتى يموت حشر معهم يوم القيامة)

واتە: هەرکەسێ خانوو[یان ماڵی خۆی] لەخاکی موشریکان بونیات بنێت، وە نەورۆز و میهرەجانەکانیان ئەنجام بدات(جەژنەکانیان)، وە خۆی بچوێنێت پێیان تاکو دەمرێت ئەوا لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێت لەڕۆژی قیامەت.

وە بە چەسپاوی لە عائیشە - رضى الله عنها - هاتووە کە ڕقی لە کورتکردنەوەی نوێژ بووە وە فەرموویەتی: (لا تشبهوا باليهود) واتە: خۆتان مەچوێنن بە جوولەکە.

هەروەها البيهقي بە ئیسنادێکی صەحیح لە عەمرو کوڕی دینار ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی: عومەری کوڕی خەطاب-رضى الله عنه- دەفەرمووێت: (لَا تَعَلَّمُوا رَطَانَةَ الْأَعَاجِمِ، وَلَا تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ فِي كَنَائِسِهِمْ يَوْمَ عِيدِهِمْ، فَإِنَّ السَّخْطَةَ تَنْزِلُ عَلَيْهِمْ)

واتە: خۆتان فێری زمانی ئەعجەمیەکان مەکەن، وە لەڕۆژی جەژنەکەیان مەڕۆنە نێو کەنیسەکانیان، چونکە تووڕەیی دادەبەزێتە سەریان).

**هەروەها بە ئیسنادێکی صەحیح ڕیوایەتی کردووە لە ئەبی ئوسامە، فەرموویەتی: عەوف بۆی گێڕاینەوە لە ئەبو موغیرەوە ئەویش لە عبدالله ـی کوڕی عەمرو فەرموویەتی:**

**(مَنْ بَنَى بِبِلَادِ الْأَعَاجِمِ وَصَنَعَ نَيْرُوزَهُمْ وَمِهْرَجَانَهُمْ وَتَشَبَّهَ بِهِمْ حَتَّى يَمُوتَ وَهُوَ كَذَلِكَ حُشِرَ مَعَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)**

**واتە: هەرکەسێ خانوو[یان ماڵی خۆی] لەخاکی بیانیەکان(ئەعجەمیەکان یان غەیرە عەرەبەکان) بونیات بنێت، وە نەورۆز و میهرەجانەکانیان ئەنجام بدات(جەژنەکانیان)، وە خۆی بچوێنێت پێیان تاکو دەمرێت بەو شێوەیە بێت ئەوا لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێت لەڕۆژی قیامەت.**

**جا سەیرکەن ئەوەتا عومەر-رضی الله عنه- نەهی دەکات لەفێربوونی زمانەکانیان وە لە ڕۆیشتن [بەهەر شێوەیەك بێت] بۆ کەنیسەکانیان لەڕۆژی جەژنەکەیان، ئەی چۆن دەبێت دەربارەی ئەنجامدانی هەندێ لە کردەوەکانیان، یاخود ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە بریتیە لە پێویستیەکانی دینەکەیان؟! ئایا موافەقە و هاوشێوەکردنیان لە کردەوە گەورەتر نیە لە موافەقە کردنیان لە زمان؟!**

**ئایا ئەنجامدانی هەندێ لە کردەوەکانیان لەڕۆژی جەژنەکەیان گەورەتر نیە لە [ تەنها ] چوونە لایان لەڕۆژی جەژنەکەیان؟!**

**وە ئەگەر توڕەیی و بوغز دابەزێتە سەریان لەڕۆژی جەژنەکەیان بەهۆی کردەوەکانیان، جا ئەوەی کە هاوبەشیان دەکات لە کردەوە یان هەندێك لە کردەوەکان ئایا ئەویش توشی سزا نابێت؟**

**ئەما عبدالله ـی کوڕی عەمرو ئاشکرایی و تەصریحی داوە کە: هەرکەسێ خانوو لە وڵاتەکەیان بونیان بنێت وە نەورۆز و میهرەجانەکەیان ئەنجام بدات و خۆی بچوێنێت پێیان تا دەمرێت ئەوا لەگەڵیان حەشر دەکرێت، ئەمەش مانای وایە کە بە کافری زانیوە بەهۆی بەشداریکردنی لە گشتی ئەو کاروکردەوانە، یاخود بە تاوانی گەورە(کبائر)ـی زانیوە کە خاوەنەکەی دەخاتە ئاگرەوە، وە ئەگەرچی ڕای یەکەم ڕووکەشی وتەکەیەتی، بەمەش بەشداریکردن لە بەشێکی ئەم شتە دەبێتە تاوان، چونکە ئەگەر کاریگەر نەبێ بۆ موستەحەق [شایەن] بوونی سزا ئەوا جائیز نەدەبوو کە بکرێت بە بەشێك لە پێویستی و مانا، چونکە شتی حەڵاڵ سزای لەسەر نادرێت،**

**هەروەها زەم و لۆمەكردن لەسەر بەشێك نابێتە مەرج و [پەیوەست] نیە بە بەشێكی ترەوە، چونكە بەشێك لەو شتانەی كە باسی كردووە دەبێتە هۆی لۆمەكردنی ئەو شتە بەتەنها(منفرد).**

**وە لە عەمرو كوڕی میمون الأودی ڕیوایەت كراوە فەرموویەتی: عومەر(رضی الله عنه) فەرموویەتی: ( ئەهلی جاهیلیەت(نەفامی) بڵاوەیان لە كۆبوونەوە [لە موزدەلیفە] نەدەكرد تاكو ئەوكاتەی خۆر هەڵدەهات، وە دەیانوت: أشرق ثبیر كیما نغیر [ئایا خۆر بەسەر چیای ثبیر هەڵهات تاكو ئێمەش هێرش بكەین و بڵاوە بكەین؟] پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) پێچەوانەی ئەوانی كرد و پێش خۆرهەڵاتن بڵاوەی كرد).**

**وە ئەو فەرموودەیە گومانم وایە كە لەو فەرموودەیە ڕیوایەتكراوە فەرموویەتی: (ڕێبازی ئێمە پێچەوانەی ڕێبازی موشریكانە)، وە بە هەمان شێوە لە عەرەفات بڵاوەیان دەكرد پێش خۆرئاوابوون، پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) پێچەوانەی كردن بە بڵاوەكردن [لە عەرەفات] لەكاتی خۆرئاوابووندا.**

**وە لە عبدالله ـی كوڕی عەمرو ڕیوایەتكراوە فەرموویەتی: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بینی من دوو كراسی سبوغكراو بە عەسفەر"[1]" ـم لەبەرە، فەرمووی: (ئەمە جلوبەرگی كافرانە، بۆیە لەبەریان مەكە)، پێشەوا موسلیم ڕیوایەتی كردووە، وە نەهیكردن لە لەبەركردنی لەبەر ئەوە بووە كە جلوبەرگی كافرانە.**

**وە لەنووسراوی عومەری كوڕی خطاب(رضی الله عنه) بۆ عوتبەی كوڕی فرقد هاتووە: (وإیاك وزی أهل الشرك) واتە: نەكەی نزیكی جلوبەرگی ئەهلی كوفر بكەویتەوە.**

**كە ئەمەش لە هەردوو صەحیحەكە هاتووە.**

**هەروەها پێشەوا الخلال لە محمد ـی كوڕی سیرین ڕیوایەتی كردووە كە حوذەیفە هات بۆ ماڵێك، بینی شتێك لە جلوبەرگی عەجەمەكانی لێیە، ئەویش دەرچوو، وە فەرمووی: هەركەسێ خۆی بە نەتەوەیەك بچوێنێت ئەوا لەوانە.**

هەروەها عەلی کوڕی ئەبی صالح السواق فەرموویەتی: ئێمە لە داوەتی مارەکردنێك بووین، لەوکات ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هات، کاتێ هاتە ژوورەوە سەیری کورسیەکی کرد لەماڵەکە کە ئەو کورسیە زیوی لەسەربوو، ئەویش دەرچوو، جا خاوەن ماڵ بەدوایدا ڕۆیشت، جا دەستی خۆی بەرەو دەموچاوی برد و فەرمووی: بەرگی ئاگرپەرستان، بەرگی ئاگرپەرستان !.

"لە قەیس ـی کوڕی ئەبی حازم ڕیوایەتکراوە فەرموویەتی: ئەبوبەکر چوو بۆ لای ئافرەتێك لە ئەحمەس کە ناوی زەینەب بوو، بینی کە قسەناکات، ئەویش فەرمووی چیەتی بۆ قسەناکات، فەرموویان بە بێدەنگی حەجی کردووە، فەرمووی: قسە بکە، چونکە ئەمە حەڵاڵ نیە ئەمە کردەوەی نەفامی و جاهیلیەتە، ئەویش قسەی کرد و وتی: تۆ کێی؟ وتی پیاوێکم لە کۆچەران(المهاجرین)، وتی: کام کۆچەران، فەرمووی: کۆچەرانی قورەیش، وتی: لەکامەی قورەیشی تۆ، فەرمووی: تۆ زۆر پرسیار دەکەی، من ئەبوبەکرم، وتی: ئایا مانەوەمان لەسەر ئەو کردەوە چاکە چی تیایە کە الله [تعالی] لەدوای جاهیلیەت بۆمانی هێناوە؟ فەرمووی: لەسەری دەمێننەوە تا ئەوکاتەی پێشەوایانتان بەردەوام بن لەسەری، وتی: پێشەوایان چین؟ فەرمووی: ئایا لە نەتەوەی ئێوە سەرکردە و سەرپەرشت نەبوون کە فەرمانیان پێدەکردن و ئێوەش گوێڕایەڵیتان دەکردن، ئەویش وتی بەڵێ، فەرمووی: جا ئەوان وان [پێشەوان] بەسەر خەڵکەوە"

پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەی ڕیوایەتی کردووە.

جا ئەبوبەکر هەواڵیدا کە بێدەنگی بە موتلەقی[بەردەوامی] حەڵاڵ نیە، وە دوای ئەوەش فەرموویەتی: ئەمە پیشەی جاهیلیەتە، مەبەستیش لەمە لۆمەکردن و عەیبدارکردنی ئەو کارەیە، وە پێشخستنی حوکم بەسەر وەسف(باسکردن یان ستایش) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وەسف دەبێتە عیللەت(ناتەواوی)، جا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەبەر ئەوەی شتەکە کردەوەی جاهیلیەتە بۆیە وەسفەکە دەبێتە هۆی نەهی لێکردن و قەدەغەکردنی.

هەروەها عومەری کوڕی خەطاب(رضی الله عنە) لە پەیامێکدا بۆ ئەو موسڵمانانەی کە لە وڵاتی فارس نیشتەجێ بوون نووسی: (إیاکم وزی أهل الشرك) واتە: نەکەن خۆتان نزیکی جلوبەرگی موشریکەکان بکەنەوە.

**ئەمەش نەهیکردنیەتی بۆ موسڵمانان، لە هەر شتێك کە جلوبەرگی موشریکەکان بێت، وە لە پەیامێکیدا بۆ عوتبەی کوڕی فرقد: (إياكم والتنعم، وزى أهل الشرك ولبوس الحرير) واتە: نەکەن نزیکی خەریکبوون بەخۆشی و ڕابواردن بکەونەوە هەروەها جلوبەرگی موشریکان و جلوبەرگە ئاوریشمیەکان.**

**هەروەها پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موسنەدی خۆی ڕیوایەتی کردووە کە: عومەری کوڕی خەطاب (رضى الله عنه) لە جابية بوو، ئینجا باسی فەتحکردنی بەیتولمەقدیس(قودس)ـی کرد، حەممادی کوڕی سەلەمە فەرمووی: ئەبو سینان لە عوبەیدی کوڕی ئادەم بۆی باسکردم، فەرمووی: گوێم لە عومەر بوو(رضى الله عنه) بە کەعب ـی فەرموو: ڕات وایە لەکوێ نوێژ بکەم؟ فەرمووی: ئەگەر لەمنەوە وەریبگری ئەوا لەپشت بەردەکەوە نوێژت دەکرد، ئەوکات قودس هەمووی لەژێر دەستت دەبوو، عومەر(رضى الله عنه) فەرمووی: هاوشێوەی جوولەکەکانت کرد ! [خۆت بەوان چواند]، نەخێر بەڵکو نوێژدەکەم لەو شوێنەی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی تیاکرد، ئەویش چوو بەرەو قیبلە و نوێژی کرد، ئینجا هات و عاباکەی سەرشانی ڕاخست و خاوێنی کردەوە، خەڵکەکەش بەدوای ئەویدا وایانکرد.**

**جا لێرەدا عومەر (رضى الله عنه) کەعبی عەیبدار کرد بەوەی کە هاوشێوەی جوولەکە دەکات، واتە: خۆچواندن بە جوولەکە تەنها لە ڕووکردنە بەردەکە، لەبەر ئەوەی کە خۆچواندنی تیایە بەو کەسانەی کە باوەڕیان وایە ئەمە قیبلەیەکی بەردەوامە، ئەگەرچی موسڵمانیش مەبەستی ئەوەی نەبێت کە نوێژەکەی بەرەو ڕووی بکات.**

**وەبەڕاستی عومەر(رضى الله عنه) لەم لایەنەوە سیاسەتی موحکەم و جێگیری هەبوو، کە گونجاو و بەجێیە لەگەڵ تەواوی ژیاننامە پڕ لە ڕەزامەندی و [قەناعەت پێ هێنەر]ـەکەی، تا ئەوکاتەی لەسەردەمی ئەودا ئیسلام بە گەورەیی بڵاو بوویەوە، وە ئیسلامی سەربەرز کرد و کوفر و ئەهلی کوفری سەرشۆڕ و زەلیل کرد، وە دروشمی دینی حەنیف(پاك و بێگەرد)ـی هەڵساند، وە هەموو کردەوە و شتێکی قەدەغەکرد کە ببێتە ڕێگاخۆشکەر بۆ پساندنی پەتی ئیسلام، کە بەم شتە گوێڕایەڵی الله و پێغەمبەرەکەی دەکرد، بەفەرمانی کتێبی الله وەستاو بوو، نوێنەری سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو، کە شوێن پێی هاوەڵەکەی هەڵگرتبوو،**

له کاروباریدا پرس و ڕاوێژی به پێشینانی یه‌كه‌م ده‌كرد(السابقين الأولين)، ته‌نانه‌ت مه‌به‌ست و گه‌ڕانه‌وه بۆ [زانینی] مه‌رجه‌كان له‌سه‌ر ئه‌هلی كیتاب[یه‌هود و نه‌صارا] هه‌ر له‌ڕێی گه‌ڕانه‌وه ده‌بێت بۆ مه‌رج و شروته‌كانی عومه‌ر، ته‌نانه‌ت قه‌ده‌غه‌ی ئه‌وه‌ی كرد كه كافر كاربه‌ده‌ست بێت، یاخود بكرێته پێشه‌وا له شتێك به‌سه‌ر ئوممه‌ت یاخود سه‌ربه‌رز بكرێت دوای ئه‌وه‌ی الله زه‌لیل و سه‌رشۆڕی كردووه، ته‌نانه‌ت ڕیوایه‌تكراوه كه هه‌ڵساوه به سوتاندنی كتێبه ئه‌عجه‌میه‌كان[غه‌یره عه‌ره‌بیه‌كان]، وه هه‌ر ئه‌ویش بوو كه ئه‌هلی بیدعه‌ی قه‌ده‌غه‌كرد له‌وه‌ی مه‌به‌ستیان بێت [ شتێك بكه‌ن ] وه به‌رگی بچووكی و زه‌لیلی كرده به‌ریان.

هه‌روه‌ها پێشه‌وا [ أبو بكر] الخلال ڕیوایه‌تی كردووه له عیكریمه و ئه‌ویش له ابن عباس - رضي الله عنهما - كه "پیاوێك پرسیاری لێكرد ئایا ده‌رزی له‌خۆم بده‌م؟

فه‌رمووی: عه‌وره‌تت ده‌رمه‌خه، وه شوێن سوننه‌ت و كرده‌وه‌ی موشریكان مه‌كه‌وه"

جا وته‌كه‌ی كه فه‌رموویه‌تی: شوێن سوننه‌ت و كرده‌وه‌ی موشریكان مه‌كه‌وه، ئه‌م ده‌ربڕینه گشتگیره{عام}ـه.

هه‌روه‌ها ئه‌بو داود له ئه‌نه‌س ڕیوایه‌تی كردووه: كه مێرد منداڵێك هاته لای و دوو قۆچ یان [دوو جێگه‌ی كۆكراوه له قژ]ـی هه‌بوو، فه‌رمووی: " ئه‌م دوو شنه بتاشن یان كورتیان بكه‌نه‌وه، چونكه ئه‌مه پۆشاكی جووله‌كه‌یه.

جا لێره‌دا عیلله‌تی نه‌هیكردن لێی [به‌وه به‌ستەوه] كه ئه‌م شتانه پۆشاكی جووله‌كه‌ن، وه عیلله‌تدار بوونی نه‌هیه‌كه به عیلله‌تێك(ناته‌واویه‌ك) ئه‌وه له‌گه‌ڵ خۆی ده‌هێنێت كه عیلله‌ته‌كه مه‌كروهه، داواكراوه كه بوونی نه‌بێت، شێخی ئیسلام ئه‌مه‌ی نه‌قڵ كردووه.

به‌هه‌مان شێوه له‌باره‌ی فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ر(صلى الله عليه وسلم) : (ئایا هیچ جه‌ژنێكی تیایه له جه‌ژنه‌كانی جاهیلیه‌ت"نه‌فامی"؟) فه‌رموویه‌تی: ئه‌مه‌ش قه‌ده‌غه‌كردن و نه‌هیه‌كی توندە بۆ هه‌ر كه‌سێك كه شتێك له جه‌ژنه‌كانی جاهیلیه‌ت ئه‌نجام بدات جا به هه‌ر ڕواڵه‌تێک بێت، جا جه‌ژنه‌كانی كافران له ئه‌هلی كیتاب و خه‌ڵكی نه‌خوێنده‌وار له دینی ئیسلام به‌هه‌مان شێوه‌یه، وه هه‌روه‌ها كوفری هه‌ردوو كۆمه‌ڵه‌كه له حه‌ڕام بووندا یه‌كسانه، ئه‌گه‌رچی هه‌ندێكی حه‌ڕامبوونه‌كه‌ی توندتر بێت له هه‌ندێكی تر

**جا ئەگەر شەرع بە یەکجاری ماددەی جەژنەکانی بتپەرستانی نەهێشتبێت لەترسی ئەوەی موسڵمان پیس ببێت بە شتێك لە کاروباری کافران ئەوانەی کە شەیطان لێیان بێهیوا بووە کە کاروبارەکەیان لە دوورگەی عەرەب جێگیر بکات، ئەوا ترسان لە پیس بوونی بە پۆخڵیەکانی ئەو کیتابیانەی کە ماون توندتر و سەختترە، وە نەهیکردن و قەدەغەکردن لێی زیاتر جەختی لێدەکرێتەوە و ئەکیدترە.**

**تا ئەو شوێنەی کە فەرمووی: وبەڕاستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) جەختی کردۆتەوە لە کاروباری ئوممەتەکەی بە پێچەوانەیی کردن لە زۆر شتی حەڵاڵکراو و سیفەتەکانی گوێڕایەڵی(طاعات)، بۆ ئەوەی ئەو شتە نەبێتە بیانوو و ڕێخۆشکەر بۆ موافەقە و ڕێکەوتن لەگەڵیان، وە بۆ ئەوەی پێچەوانەکردنیش لەم شتە ببێتە بەربەست و قەدەغەکار لە تەواوی کاروبارەکانی تریان، چونکە هەرچەندەی پێچەوانەیی کردن لەنێوان تۆ و ئەهلی دۆزەخ زیاتر ببێت ئەوا زیاتر لە کردەوەکانی ئەهلی دۆزەخ دوور دەکەویتەوە.**

**جا دوای پێداگری و ئامۆژگاریکردنی بۆ ئوممەتەکەی هیچ ئامانج و مەبەستێکی تر بەدەست نایەت لەوە زیاتر [ لەلایەن کەسانی تر جگە لە پێغەمبەر]، هەموو ئەمەش فەزڵی الله ـیە بەسەر ئەو و بەسەر خەڵکدا، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم شتە نازانن.**

**وتم - شێخ حەمەد -: کەوایە جەختکردنەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە فەرمانی ئوممەتەکەی بۆ پێچەوانەیی کردنی کافران، لەترسی لاسایی کردنەوە و خۆچواندن بووە پێیان لەڕێگا و هیدایەتی ئاشکرا و ڕوون، کە سەردەگرێت و دەڕوات بەرەو ڕازیبوون و موافەقەکردنیان هەروەها دۆستایەتی کردنیان، ئەی کەوایە زۆرێك لەوانەی لافی ئیسلام لێدەدەن چیان لێهاتووە لەکاتێکدا کەوتوونەتە نێو هەمان ئەو شتەی کە ئاگاداری لەسەر دراوە، وە لەگەڵ ئەوەشدا وا حیساب دەکەن کە کارێکی چاك دەکەن؟**

**وە پێشەوا ئەبو داود لە سونەنی خۆی و غەیری ئەویش لە فەرموودەی هشیم ڕیوایەتیان کردووە فەرموویەتی: أبو بشر هەواڵی پێداین لە ئەبی عومەیری کوڕی ئەنەس، لە کەسانێکی خۆس لە ئەنصار(پشتیوانان) فەرموویەتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خەمی هەڵگرت بۆ نوێژ، وە چۆن خەڵکی بۆ کۆبکاتەوە، ئەوانیش باسی زوڕنای جوولەکەیان کرد بۆی**

بەڵام بەدڵی نەبوو، وە فەرمووی: (ئەمە لەکاروباری جوولەکەیە)، وە فەرمووی: وە باسی زەنگوڵەیان کرد، فەرمووی: (ئەمە لەکاروباری گاورەکانە(نەصارا)..) تاکۆتایی فەرموودەکە.

لە کتێبی القاموس فەرموویەتی: شبور کتنور: ئەو زوڕنایەی کە فوی تیادەکرێت... اھ.

مەبەست لەوەش: کاتێك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) زوڕنای جوولەکەی لا بوغزاو بوو کە بە دەم فوی تیادەکرا، هەروەها زەنگوڵەی گاورەکان کە بەدەست لێدەدرا، ئەم شتەی بە عیللەت(ناتەواو) دانا بەوەی کە لەکاروباری جولەکەیە، وە ئەمەی تریشی بە ناتەواو دانا بەوەی کە لەکاروباری گاورەکانە، چونکە باسکردنی وەسف پێش حوکم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو شتە عیللەتە(ناتەواوییە) بۆ ئەو شتە، ئەمەش ئەوە دەگرێتەوە کە نەهی کردووە لەهەموو شتێك کە لەکاروباری جولەکە و گاورەکان(نەصارا) بێت، وە مانای کەڕاهەت و بوغزاندنی ئەو دەنگانەیە بە موتڵەقی(یەکسەری) چ بۆ نوێژ بێت یان بۆ غەیری نوێژ بێت، چونکە لەکاروباری جوولەکە و گاورەکانە.

چونکە گاورەکان زەنگوڵەیان لێدەدا لەژمارەیەك کاتی تر جگە لەکاتی پەرستشەکانیان، بەڵکو بەڕاستی دروشمی دینی حەنیف(ڕاست و دروست) بریتیە لە آذان(بانگ) کە ڕاگەیاندن بە زیکر و یادی الله لەخۆدەگرێت، کە [ بەو بانگە ] دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە و شەیطانەکان ڕادەکەن، وە ڕەحمەت دادەبەزێت.

وەبەڕاستی زۆرێك کەس لەم ئوممەتە لە کەسانی بەندە و غەیری ئەوانیش توشی ئەم دروشمانەی جولەکە و گاورەکان بوون، وە ئەم خۆچوندانەش بە جولەکە و گاورەکان و ئەعجەمیەکان لە ڕۆم و لەفارس، بەهۆی زاڵبوونی پادشاکانی ڕۆژهەڵات بوو بەم شتانە و هاوشێوەکانیان کە پێچەوانەی ڕێگا و هیدایەتی موسڵمانانیان کرد وە چوونە نێو شتانێك کە لەلای الله و پێغەمبەرەکەی شتێکی بوغزێنراوە، بەهۆیەوە الله تعالی تورکە کافرەکانی زاڵکرد بەسەریاندا ئەو [ تورکانەی ] کە وەعد و پەیمانی شەڕکردن لەگەڵیان لەئارادایە، تەنانەت شتانێکیان کرد بەسەر وڵات و خەڵکەکەدا کە هەرگیز شتی لەم شێوەیە لە وڵاتی ئیسلام ڕووینەداوە، ئەمەش ڕاستی و تەصدیقی فەرموودەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەردەخات کە فەرموویەتی: (لترکبن سنن من کان قبلکم) واتە: بەسەر ڕێگا و ڕێڕەوی ئەوانەی پێش خۆتاندا دەڕۆن، (قسەکانی تەواو بوون لەکتێبی الاقتضاء)

وه هەروەها سزاكە ڕوویداوه لەسەر پێچەوانەیی كردنی ڕێگای موسڵمانان بە زاڵبوونی توركە كافرەكان بەو پێیەی كە شێخی ئیسلام باسی كردووه، هەمان شێوەی ئەو شتە لەم سەردەمە ڕوویداوه، چونكە [ بەناو موسڵمانەكان ] ئەوانەی خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلامەوە كاتێك ڕێگای زۆرێك لە كارەكانی جوولەكە و گاورەكان و ئەهلی جاهیلیەتە موشریكەكان و دوژمنانی دین لە ئەعجەمیەكانیان گرتەبەر وە خۆیان بەوان چواند و هاوەشێوەی ئەوانیان كرد لە زۆرێك لە كاروبارەكان بەهۆیەوە توركەكان كە لە شەریعەتی ئیسلام دەرچوون زاڵبوون بەسەریاندا.

جا بەڵاو میحنەتی گەورە بەسەر ئیسلامدا هات، وە فیتنەی زەبەلاح كە تەنانەت سەرۆكیش زەلیل دەكەن، وە شێخی گەورەش سەرشۆڕ دەكەن، وە هیچ ڕەحمیان نەكرد بە كەسی بێدەسەڵات و كەسی لاواز وە دینەكانیان توشی خراپە و فەساد كرد، وە وڵاتەكانیان كاول كرد، وە سوكایەتیان بەلاشەكان كرد، ئەمەش هەمووی بە حیكمەتی الله كە [زاڵ و بەدەسەڵاتە]، سزایەك بۆیان بەهۆی ستەم و سەرپێچی كردنیان، والله المستعان وعليه التكلان.

بەڵام لە ڕەحمەتی الله تعالى ئەوەیە كە حەق هەرگیز لەناوناچێت، وە الله تعالى هەر دینی پێغەمبەرەكەی سەردەخات {يُرِيدُونَ أَن يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلَّا أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ (32) هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ} [التوبة : 32-33]

واتە: (ئەوانە بەو بیروباوەڕە پووچانەیانەوە) دەیانەوێت نوورو ئاینی الله بەقاڵەی دەمیان بكوژێننەوە و خامۆشی بكەن (بەڵام خەیاڵیان خاوە) الله لێناگەڕێت ئاواتیان بێتە دی و نوور و دینی خۆی تەواودەكات و سەریدەخات، هەرچەندە كافرو بێ باوەڕان پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن.

هەر ئەو زاتە بۆیە پێغەمبەرەكەی هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئایینی ڕاست و دروستدا ڕەوانە كردووە تا سەری بخات بەسەر هەموو بەرنامە و ئاینەكانی تردا، هەرچەندە موشریک و هاوەڵگەران پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن.

جا كاتێك الله تعالى ئەهلی ئیمانی تاقیكردەوە وە ئەو سزا و عقوبەیە كۆتایی هات لەسەریان بەهۆی سەرپێچی كردنیان، وە لوتی خراپەكاران و كافران بەرز بوویەوە، هەروەها وا گومانیان برد كە دەوڵەت و سەركەوتن هەر بۆ ئەوانە تاهەتایی

**[ لەوکاتەدا ] الله تعالى خۆری ئیسلام و ئیمانی زاڵکرد بەسەریاندا، بەهۆیەوە هەموویانی پارچە کرد لەزووترین کات، وە پەرت و بڵاوی کردن بۆ ئەمسەر و ئەوسەری وڵاتان، ابن القیم - رحمه الله - فەرموویەتی:**

**والله ناصر دينه وكتابه**
**ورسوله في سائر الأزمان**
**ولكن بمحنة حزبه من حزبه**
**ذا حكمة مذ كانت الفئتان**

**وە الله سەرخەری دین و کتێبەکەیەتی**
**وە پێغەمبەرەکەی لە هەموو سەردەمانێکدا**
**بەڵام بە تاقیکردنەوەی حیزبەکەی لە حیزبەکەیدا**
**کە حیکمەتی تێدایە جا کۆمەڵەکان هەرچەندە بن.**

**هەروەها فەرموویەتی:**
**والحق منصور وممتحن فلا**
**تعجب فهذه سنة الرحمن**
**وبذاك يظهر حزبه من حزبه**
**ولأجل ذاك الناس طائفتان**

**حەق سەرکەوتووە و تاقیکراوە جا نەکەی**
**توشی سەرسوڕمان ببیت چونکە ئەمە سوننەتی ڕەحمانە(الله)**
**وە بەمەش حیزبەکەی دەردەچێت و دەردەکەوێت**
**وە لەپێناو ئەمەشدا خەڵکی دوو کۆمەڵ و دەستەن**

**هەروەها شێخی ئیسلام لە وتەکانیدا لەسەر مەرجەکانی ئەهلی زیممە فەرموویەتی: ئەمەش واتای ئیجماع و کۆدەنگی موسڵمانانە لەسەر جیابوونەوە لەکافران بەڕووکەش، وە وازهێنان لەخۆچواندن پێیان، وە بەڕاستی پێشتر سەرکردە دادوەرەکان وەکو هەردوو عومەرەکە و غەیری ئەوانیش جەختیان دەکردەوە و [هەوڵیان زۆر دەدا] بۆ بەدیهێنانی ئەو شتە کە تەواو جێی مەبەست بێت.**

**هەروەها أبو الشيخ الأصبهاني رحمه الله ڕیوایەتی کردووە کە عومەر رضي الله عنه فەرمانی کرد نوسی: نامەگۆڕینەوە و ڕێککەوتن لەگەڵ ئەهلی کیتاب مەکەن بەهۆیەوە خۆشەویستی دۆستایەتی بڕوات لەنێوانتان، وە نهێنیتان نەبێت لەگەڵیا، وە زەلیلیان بکەن و ستەمیان لێمەکەن.**

**ئینجا شيخ الإسلام فەرموویەتی: وە لەنێو مەرجەکان: ئەو شتانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ شاردنەوەی خراپە و مونکەرەکانی دینەکەیان، هەروەها وازهێنان لە دەرخستنی، هەروەها ئەوەش کە دەگەڕێتەوە بۆ دەرخستنی دروشمی دینەکەیان، جا عومەر (رضي الله عنه) لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی کە لەگەڵیدابوون و تەواوی ئەو زانایانەی کە لەدوایاندا بوون و هەرکەسێکیش کە الله عز وجل تەوفیقی دابێت(سەرکەوتووی کردبێت) لە کاربەدەستان لەسەر ئەوەی: قەدەغەیان بکەن کە لەخاکی ئیسلامدا شتێك دەربخەن کە تایبەت بێت بەخۆیان، ئەمەش وەك موبالەغە و جەخت کردنەوەی زیاتر بۆ ئەوەی لە خاکی ئیسلام(دار الإسلام) هیچ تایبەتمەندیەکی موشریکان دەرنەکەوێت، ئەی باشە چی دەربارەی موسڵمانان کە خۆیان ئەنجامی بدەن و ئاشکرای بکەن؟!**

**وە لەوانەش ئەو شتانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ وازهێنان لە ڕێزگرتن لێیان، وە پەیوەست کردنیان بە زەلیلی و بچووکی کە الله تعالى شەرعاندوویەتی، وە زانراویشە کە گەورەکردنی جەژنەکانیان و ڕازی بوون پێی و شتی لەم شێوەیە جۆرێکە لە ڕێزگرتن لێیان و شکۆمەند کردنیان، چونکە ئەوان دڵخۆش دەبن بەو شتە، وە خۆشی دەبینن لەمەدا، هەروەك چۆن خەمبار دەبن بە پشتگوێ خستنی دینە پوچەڵەکەیان.**

هەروەها شیخ الإسلام فەرموویەتی: هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ} [الأنعام : 159]

واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئاینەکەیان بەش بەش کردو بوونە دەستە دەستە و پارچە پارچە (بڕوایان بەهەندێکی قورئان هەیە و هەندێکی تری پشت گوێ دەخەن)، ئەوە لە هیچ شتێکدا تۆ لەوان نیت، بەڵکو تۆ لەوان بەریت.

جا شتێکی زانراوە کە کافران دینی خۆیان پارچە پارچە کردووە و بوون بە چەندین دەستەو گرووپ، هەروەك الله تعالى فەرموویەتی: {وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا} [آل عمران : 105] واتە: وەك ئەوانە مەبن کە ناکۆکی و دووبەرەکی پەیدابوو لەناویان.

هەروەها بە نێردراوەکەی خۆی فەرموو: {لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ} واتە: ئەوە لە هیچ شتێکدا تۆ لەوان نیت، بەڵکو تۆ لەوان بەریت.

ئەمەش واتا پێویستە لێیان بەریئـ بێت لە هەموو شتێك.

وە هەر کەسێکیش شوێن کەسێکی تر بکەوێت لەهەندێ لە شتەکانی ئەوا ئەو کەسە سەر بەو کەسەیە لەو شتەدا، چونکە وتەی کەسێك کە دەڵێت: (أنا من هذا، وهذا منی) واتە: ئەو کەسە لەمنە و منیش لەو کەسەم.

واتە: من لەجۆری ئەوم، ئەویش لەجۆری منە، چونکە دوو کەس هەرگیز نابن بە یەك تەنها بە جۆر و شێواز نەبێت، هەروەك لە فەرموودەی الله تعالى هاتووە: {بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ} واتە: هەندێکیان سەر بە هەندێکی تریانن.

هەروەها فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بۆ عەلی: (أنت منی وأنا منك) واتە: تۆ لەمنی و منیش لەتۆم.

هەروەها وتەی کەسێك کە دەڵێت: (لست من هذا في شيء) واتە: تۆ هیچت لەو شتەدا نیە(یان تۆ بەریت لەم شتە.

واتە: من بەریئم لە هەموو شتێکی، جا ئەگەر الله تعالى پێغەمبەرەکەی بەری کردبێ لەهەموو شتەکانیان، کەوایە هەرکەسێ شوێنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کەوتبێت بە حەق ئەوا لێیان بەری دەبێت هەروەکو بەریئـ بوونی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)

وەهەرکەسێکیش ڕێکەوتن و ڕازی بوونی هەبێت لەگەڵیان ئەوا پێچەوانەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ـی کردووە بەقەدەر ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ ئەواندا.

چونکە دوو کەس کە جیاواز بن بەهەموو شێوازێك ئەوا چەندەی یەکێکیان خۆی بچوێنێت(خۆچواندنی هەبێت) ئەوا ئەویتریان پێچەوانەی دەبێت.

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ}

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، گاور و جوو مەکەن بە دۆست و پشتیوانی خۆتان.

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ تَوَلَّوْا قَوْمًا غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ} [المجادلة : 14]

واتە: ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە پشتگیریان لە هۆزێك کرد، کە الله خەشمی لێ گرتوون و ڕقی لێیانە، ئەو دووڕووانە نە سەر بە ئێوەن، نە سەر بەوانیشن.

لەم ئایەتەشدا ئەو دووڕووانە عەیبدار دەکات کە دۆستایەتی جوولەکەیان کردووە.

تا ئەو جێگایەی کە فەرموویەتی: {لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ} [ المجادلة:22]

واتە: کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە الله و بە ڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کە دژایەتی الله و پێغەمبەرەکەیان کردبێت.

تا کۆتایی سورەتەکە.

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ} [الأنفال : 72]

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووەو تێکۆشاون لە پێناوی ئاینی الله بە خۆیان و ماڵ و سامانیانەوە، ئەوانەش کە پێشوازیان لە کۆچبەران کردو لەماڵ و حاڵی خۆیاندا جێیان کردنەوە و پشتگیریان کردن، ئا ئەوانە هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن.

جا الله تعالى دۆستایەتی و پشتیوانی پێکهێناوە لەنێوان کۆچەران و پشتیوانان(المهاجرين والأنصار) و ئەوانەش کە ئیمانیان هێناوە لەدوای ئەوان و کۆچیان کردووە و جیهادیان کردووە تا ڕۆژی قیامەت، کۆچەریش ئەو کەسە کە کۆچ بکات لەشتانێك کە الله تعالى نەهی کردووە لێیان، هەروەها جیهادیش بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت.

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: {إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا} [المائدة : 55] واتە: بەڕاستی تەنها خۆشەویست و پشتیوانی ئێوە، هەر الله و پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن باوەڕیان هێناوە.. هەردوو ئایەتەکە.

وە هاوشێوەی ئەمەش لەچەندین شوێنی قورئان هەیە، الله سبحانه وتعالى فەرمان دەکات بە دۆستایەتی کردنی ئیمانداران بەحەق ئەوانەی کە حیزب و سەربازی ئەون، وە هەواڵی داوە کە ئەوان هەرگیز دۆستایەتی کافران ناکەن.

وە سۆزیان بۆ دەربڕین هەروەها دۆستایەتی و نەرمونیانیش دەربڕین بۆیان ئەگەرچی ئەو شتە بەدڵیشەوە پەیوەست بێت، بەڵام پێچەوانەکردن لەڕووکەش زیاتر یارمەتیدەرە بۆ وازهێنان و بڕینەوە لەگەڵ کافران و لێ جیابوونەوەیان.
وە بەشداریکردن لەگەڵیان لەڕووکەش - ئەگەرچی بەهانەش نەبێت یان هۆکاری نزیکیش نەبێت یان هۆکارێکی دووریش نەبێت بۆ شێوازێك لە موالات و سۆزداری - بەڵام بەرژەوەندی لەگەڵ بڕینەوە و لێ جیابوونەوەی تێدانیە(نابێتە هۆی جیابوونەوە و بڕینەوە لەگەڵیان)، ئەگەرچی بانگەواز دەکات بۆ جۆرێك لە پەیوەندی هەبوون، هەروەك سروشت ئەم شتە دێنێت لەگەڵ خۆیدا، وە عادەت و کلتوور ئاماژەی پێدەدات، هەر بۆیەش پێشینان (رضى الله عنهم) بەڵگەیان بەم ئایەتانە دەهێنایەوە لەسەر وازهێنان لە پشتبەستن پێیان لەکاروباری ویلایات و بەڕێوەبردنەکان.
پێشەوا ئەحمەد بە ئیسنادێکی صەحیح لە ئەبی موسای ئەشعەری - رضى الله عنه - ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی: وتم بە عومەر رضى الله عنه: من نوسەر(گەیەنەر)ـێکی گاور(نەصرانی)ـم هەیە، فەرمووی: ئەوە چیتە الله بتکوژێت؟ ئایا نەتبیستووە الله تعالى فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ} [المائدة : 51]

واته: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان.
ئایا کەسێکی حەنیف(موسڵمان) نەبوو بیکەیتە نوسەری خۆت؟ فەرمووی: وتم: ئەی ئەمیری ئیمانداران، نووسینەکەی بۆ منە و ئەویش دینەکەی بۆ خۆیەتی، فەرمووی: من ڕێزیان لێناگرم لەکاتێکدا الله تعالی ڕیسوا و سوکی کردوون، وە سەربەرزیان ناکەم لەکاتێکدا الله تعالی سەرشۆڕی کردوون، وە لێیان نزیك ناکەومەوە لەکاتێکدا الله تعالی دووری خستوونەتەوە.
وە هەروەك مانای قورئان ئاماژەی پێداوە، بەهەمان شێوە سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هاتووە، وە سوننەتی خەلیفەکانی ڕاشدین - کە زانایان و فوقەهاء کۆکن لەسەری - بە پێچەوانەیی کردنیان و وازهێنان لەخۆچواندن پێیان.

لە هەردوو صەحیحەکە هاتووە لە ئەبو هورەیرە-رضي الله عنه- ڕیوایەتکراوە فەرموویەتی: نێردراوی الله(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (جوولەکە و نەصارا قژی خۆیان ڕەنگ ناکەن بۆیە پێچەوانەیان بکەن) فەرمانی کردووە بە پێچەوانەکردنیان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە خودی پێچەوانەیی کردنەکە شتێك بێت لە شەرعدا مەبەستەکەی هاتبێت، چونکە ئەگەر بابەتەکە بەخودی پێچەوانەیی کردن بێت ئەوە مەبەستەکە بەدەست دێت، وە ئەگەر فەرمانەکە بەهۆی گۆڕینی ڕەنگی قژ بێت بەتەنها ئەوا بەهۆی بوونی پێچەوانەیی و موخالەفەیە تیایدا.
چونکە پێچەوانەیی کردن: یان ئەوەتا عیللەت(ناتەواوی)ـێکی تاکە، یاخود عیللەتێکی ترە، یاخود بەشێکی عیللەتەکەیە، وە بەپێی پێشدەستیەکان ئەو عیللەتە فەرمانی پێدەکرێت کە لە شەرعدا داواکراوە(واتە پێچەوانەیی کردنی).
هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ} [الفرقان : 72]
واتە: (بەندەکانی الله) ئەوانەشن کە شایەتی ناحەق نادەن.
الضحاك فەرموویەتی: الزور: "جەژنی موشریکانە" أبو الشيخ بە ئیسنادی خۆی ڕیوایەتی کردووە، وە بە ئیسنادی خۆی لە الضحاك ـەوە: الزور: "وتەی شیرك" وە بە ئیسنادی خۆی لە ابن مرة: "تێکەڵاوی و یارمەتی ئەهلی شیرك ناکەن لەسەر شیرکەکەیان"

**وە بە ئیسنادی خۆی لە عطاء ــی کوڕی یەسار هاتووە فەرموویەتی: عومەر فەرموویەتی: "نەکەن نزیکی زمانی ئەعجەمیەکان بکەونەوە، وە نەکەن بچنە نێو کەنیسەکانی موشریکان لەڕۆژی جەژنەکەیان".**

**وە وتەی ئەو تابعیانە کە «جەژنی کافرانە» پێچەوانەی وتەی هەندێکی تریان نیە کە دەڵێن: «شیرکە» یاخود بتێك بووە لە جاهیلیەت، وە بە وتەی هەندێکیان: «بریتیە لەدانیشتنە بێ ئابڕووەکان» وە وتەی هەندێکیان: «بریتیە لە گۆرانی وتن» چونکە عادەتی پێشینان لە تەفسیرکردن بەو شێوەیە بووە، هەر پیاوێك جۆرێك لەجۆرەکانی دەستەواژە باس دەکات، بەهۆی پێویستی کەسی بیسەر، یاخود بۆ ئەوەی ئاگاداری بدات لەسەر خودی ئەو شتە.**

**وە ڕووکەشی تەفسیری تابعیەکان ئەوەیە کە الزور: بریتیە لە شتێکی جوانکراو کە لەناوەڕۆکدا پیس بێت، تاکو وای لێدێت بەپێچەوانەی ئەو شێوازە دەردەکەوێت کە لەحەقیقەتدا هەیە**

**هەر بۆیەش پێشینان بەو شێوەیە تەفسیریان کردووە: هەندێ جار بەو شتە جوانانەی کە لێی دەردەکەون بەهۆی ئەو گومان و شوبهانەی کە دەرکراون، یان بەهۆی حەز و ئارەزوویەك، چونکە شیرك و شتی لەم شێوەیە بەجوان و چاکی دەردەکەوێت بەهۆی شوبهە و گومانێك، هەروەها گۆرانی وتن و شتی لەم شێوەیە بەچاکی و جوانی دەردەکەوێت بەهۆی حەز و ئارەزوو.**

**ئەما جەژنەکانی موشریکان گومان و ئارەزووی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە، کە ئەوەش باطل و پوچەڵە چونکە هیچ سودێکی تیانیە بۆ دین، ئەو خۆشی و لەزەتە کورتخایەنەش کە تێیدایە سەرەنجامەکەی ئازار و سەختییە، بەهۆیەش بوو بە الزور(وتە یان شتێکی پوچەڵ)، وە لەناوبوونی واتە: ئامادە بوون تیایدا، جا کە الله تعالی مەدحی وازهێنان و جێهێشتنی ئامادەبوونی کردووە تیایدا کە تەنها بینینە یان بیستنە، ئەی کەواتە چی دەربارەی ڕازی بوون پێی و موافەقەکردنی کە کردەوەش بۆ ئەمە زیاد دەکات و دەبێتە کردەوەی زور(پوچ) نەك تەنها حەز ئارەزوو بێت؟!**

**وە بزانە کە ئەگەر ئێمە هیچ شتێک نەزانین لە ڕازی بوون و موافەقەکردنی تەنها ئەوە نەبێت کە ڕێ خۆشدەکات بەرەو ئەو شتە پیس و پۆخڵانە، ئەوا لەوکاتە کردەوەی ئێمە بەو شتەی کە سروشت لەسەری ڕێکە و بەڵگە هێنانەوەشمان بە بنچینەکانی شەریعەت دەبووە هۆی نەهی کردن لەو بەهانەیە، ئەی کەوایە چی لەکاتێکدا ئێمە چەندین مونکەرات و خراپەمان بینیوە کە تەنها لاسایی کردنەوە بووە هۆی ئەمە، کە لەوانەیە دەرچوونی یەکجارەکی لە ئیسلام بهێنێت لەگەڵ خۆی؟!**

**جا نهێنی ئەمەش: ئەوەیە کە لاسایی کردنەوە و خۆچواندن زۆربەی جار خاوەنەکەی بەرەو کوفر و سەرپێچی دەبات، یاخود بەرەو هەردووکیان دەیبات بەگشتی، هەرشتێکیش خاوەنەکەی بەرەو ئەو شتانە ببات ئەوا حەڕامکراوە.**

**ئەمە هەندێك بوون لەو بەڵگانەی کە نەهی دەکەن لە خۆچواندن بە موشریکان و کافران، بەڵام ڕەحمەتی الله لەو کەسە بێت کە ئاگاداری ئەو نهێنیەیە کە قسەکان لەسەری کران، بریتیە لە: خۆچواندن لەڕووکەشی ئاشکرا نەهی لێکراوە چونکە دەبێتە هۆی هێنانی جۆرێك لە دۆستایەتی و سۆزداری ناخ، هەروەها خاوەنەکەی بەرەو کوفر و سەرپێچی دەبات، کە ئەمەش هۆکارە بۆ حەڕامکردنی و نەهی لێکردن(قەدەغە کردنی)**

**جا ئەگەر ئەمەت زانی و بۆت ڕوون بوویەوە ئەوەی کە زۆرێك لە خەڵکی یان زۆربەیان کەوتوونەتە ناویەوە لە دۆستایەتی و موالاتی کافران و موشریکان، کە بەڕاستی نەهی کراوە لەم شتانە لەترسی کەوتنە ناو دۆستایەتی ئەوا بۆت ڕوون دەبێتەوە کە ئەوان کەوتوونەتە نێو هەمان شت کە ئاگاداری لەسەردراوە(خۆچواندن) وە کەوتوونەتە ناوەندی خاکی لەناوچوون و هەلاکەت، وە بێگومان هەر الله هیدایەتدەری سەر ڕێگای ڕاستە.**

## بەشێك

## باسکردنی هەندێك لە وەڵامەکان دەربارەی هەندێ لەو پرسیارانەی کە ژمارەیەك لە موسڵمانان کردیان لە کوڕەکانی شیخ الإسلام محمد کوڕی عبدالوهاب رحمهم الله تعالی وعفا عنهم

لەوانە: ئایا وتەی ئێوە چیە دەربارەی پیاوێك کە هاتبێتە نێو ئەم دینە و خۆشی بوێت، بەڵام دوژمنایەتی موشریکان ناکات، یان دوژمنایەتیان دەکات بەڵام تەکفیریان ناکات(بەکافریان نازانێت)، یان بڵێت: من موسڵمانم بەڵام ناتوانم تەکفیری ئەهلی لا إله إلا الله بکەم، ئەگەرچی ماناکەشی نەزانن؟ وە پیاوێکیش هاتبێتە نێو ئەم دینە و خۆشی بوێت، بەڵام بڵێت: من بەرهەڵسی قوببە و گومەزەکان ناکەم ( کە دروستکراون لەسەر گۆڕەکان) وە دەزانم کە هیچ زیانێك و هیچ سودێك ناگەیەنن بەڵام بەرهەڵستی ناکەم؟

وەڵام: پیاو نابێتە موسڵمان مەگەر دوای فێربوونی تەوحید نەبێت و دانی پێدا بنێت و کردەوە بە واجبەکانی بکات، هەروەها پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەڕاست بزانێت لەوەی کە هەواڵی دەربارە داوە، وە گوێڕایەڵی بکات لە هەرچی نەهی لێکردبێت وە فەرمانی پێکردبێت، وە باوەڕی پێ بهێنێت و بەوەش کە لەگەڵ خۆی هێناویەتی.

جا هەرکەسێك بڵێت: دوژمنایەتی موشریکان ناکەم یان دوژمنایەتیان بکات و تەکفیریان نەکات، یان بڵێت: بەرهەڵستی ئەهلی لا إله إلا الله ناکەم ئەگەرچی کوفر و شیرکیش ئەنجام بدەن و دژایەتی دینی الله ـش بکەن، یان بڵێت: بەرهەڵستی گومەز و قوببەکان ناکەم..، ئەم کەسە نابێتە موسڵمان، بەڵکو ئەو لەو کەسانەیە کە الله تعالی دەربارەیان فەرموویەتی: {..وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا (150) أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا} [النساء : 150-151]

واته: دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بەهەندێک - لە دینەکە - و باوەڕ بەهەندێکی تری ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەک بۆ خۆیان بەدەست بهێنن.

ئا ئەو کەسانە بەڕاستی هەر بێ باوەڕن و بۆ بێ باوەڕان سزایەکی سەر شۆڕکەرمان ئامادەکردوە.

هەروەها الله سبحانە وتعالی دوژمنایەتی کردن و خۆدوورخستنەوە و تەکفیرکردنی موشریکانی واجب کردووە، فەرموویەتی: {لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ} [المجادلة : 22]

واتە: کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە الله و بە ڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کە دژایەتی الله و پێغەمبەرەکەیان کردبێت، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باوو باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن.

هەروەها فەرموویەتی: {وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ} [المائدة : 51] واتە: ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی الله هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

هەروەها: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ} [الممتحنة : 1]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەنە دۆستی گیانی بەگیانی، لەکاتێکدا خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەردەبرن، بەڕاستی ئەوان بێ باوەڕیش بوون بەوەی لە لایەن الله بۆتان هاتووە، ئەوانە پێغەمبەر - لەخاکەکەی - دەردەکەن.... تا کۆتایی ئایەتەکان والله أعلم، نەقڵ کراوە لە وەڵامی شێخ حوسێن کوڕی شێخ محمد کوڕی عبد الوهاب وە براکەی عبدالله - کوڕی شێخ محمد -..

وە لەهەندێ وەڵامی تر: ئایا وتەی ئێوە دەربارەی دۆستایەتی و دوژمنایەتی(الموالاة والمعاداة) چیە، ئایا بریتیە لەمانای لا إله إلا الله یان لە لوازمەکان(پێوە بەندەکان)ــی؟

**وەڵام: بوترێت: - الله زاناترە - موسڵمان بەسیەتی کە بزانێت الله تعالی دوژمنایەتی کردنی موشریکانی لەسەر واجبکردووە، هەروەها دۆستایەتی نەکردنیان، هەروەها خۆشویستنی ئیمانداران و دۆستایەتی کردنیان واجبی کردووە لەسەری، وە هەواڵی داوە کە ئەمە لە مەرجەکانی ئیمانە، هەروها ئیمانی نەفی کردووە(ڕەتی کردۆتەوە) لە کەسێك کە دۆستایەتی هەرکەسێك بکات کە دژایەتی الله و پێغەمبەرەکەی دەکات، ئەگەرچی باوانیان بن یان کوڕەکانیان بن یان براکانیان بن یان هۆز و عەشیرەتیان بن، ئەما خودی ئەو شتە کە لەمانای لا إله إلا الله بێت یان لە پێبەندەکانی بێت، ئەوا الله تعالی داوای لێ نەکردووین کە بەدوای ئەمەدا بگەڕێین، بەڵکو ئەوەی داوای لێکردووین ئەوەیە کە الله تعالی ئەمەی واجب کردووە و پێویستی کردووە، هەروەها واجبی کردووە کە کردەوەی پێ بکرێت، جا ئەمە بریتیە لەو فەرز و حەتمیەی کە هیچ گومانی تێدانیە.**

**هەرکەسێکیش زانی کە ئەمە لە ماناکەیەتی یان بە پێبەندەکانیەتی ئەوا شتێکی چاکە و خێری زیاترە، هەرکەسێکیش نەیزانێت ئەوە داوالێکراو نیە بە زانینی، بەتایبەت ئەگەر مشتومڕ لەم بابەتە و ململانێ تیایدا ببێتە هۆی شەڕ و خیلاف(ڕاجیایی)، وە کەوتنەوەی پەرتەوازەیی لەنێو ئەو ئیماندارانەی کە هەڵساون بە واجبەکانی ئیمان، وە لەپێناو الله جیهادیان کردووە و دوژمنایەتی موشریکانیان کردووە، وە دۆستایەتی موسڵمانانیان کردووە، کەواتە بێدەنگ بوون لەسەر ئەمە واجبە و پێویستە، ئەمەش هەر ئەوەیە کە بۆم دەرکەوتووە بەوەی کە ڕاجیایی و ئیختیلاف نزیکە لەجێگەی مانا، والله أعلم.**

**جا ئەمە هەندێ بەڵگە بوون لەسەر واجب بوونی بڕینەوە لەگەڵ کافران و موشریکان، کە ئەمەش مەسەلەی یەکەم بوو.**

## ئەما مەسەلەی دووەم کە بریتیە لەو شتانەی مرۆڤ پێی هەڵدەگەڕێتەوە لە دین(موڕتەد دەبێتەوە) :

یەکێکیان: هاوبەشدانان بۆ الله ئەویش ئەوەیە کە لەناو دروستکراوەکانی الله هاوشێوەیەک بۆ الله بڕیاربدەی داوای لێ بکەی هەروەك چۆن داوا لە الله دەکەی، لێی بترسی هەروەك چۆن لە الله دەترسیت یان پشت بەدروستکراوێك ببەستیت هەروەك چۆن پشت بە الله دەبەسترێت یان شتێ لەعیبادەت بۆ دروستکراوێك ئەنجام بدەیت جائەگەر ئەوەی کرد ئەوا کافربووەو دەرچووە لەئیسلام ئەگەرچی بەڕۆژ بەڕۆژوو بێت و بەشەو شەونوێ ژبکات بەڵگەش لەسەر ئەمە وتەی الله ـیە کە فەرموویەتی: {وَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُو إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ} [الزمر : 8]

کاتێ مرۆڤێك زیانێکی لێ بکەوێ دەگەڕێتەوە بۆلای الله و هاواری لێ دەکات پاشان ئەگەر الله لەلایەن خۆیەوە نیعمەتێکی پێ بەخشی ئەوکات ئەوەی لەبیردەچێت کە لەپێشتردا هاواری بۆی کرد دەچێت هاوتایانێك بۆ الله دادەنێت بۆئەوەی لەوڕێگایە گومڕای بکات

ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) بە هەڕەشەوە) بڵێ بە کوفرەکەت کەمێ چێژ وەرگرە چونکە بەڕاستی تۆلەهاوەڵانی ئاگری دۆزەخی.

هەروەها الله تعالی فەرمویەتی {وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ} [المؤمنون : 117]

واتە: هەرکەس پەرستراوێکی تر لەگەڵ الله بپەرستێ کەهیچ بەڵگەیەکی نەبێ لەسەر ئەو (پەرستنە) ئەوە بەڕاستی لێپرسینەوەی تەنها لای پەروەردگاریەتی بێگومان کافران لای الله ڕزگار نابن.

وەجگە لەو ئایەتانەش کەبەڵگەن لەسەرئەوەی هەرکەس دروستکراوێك لەدروستکراوەکان بکاتە هاوبەش بۆ الله لەعیبادەتیدا ئەوا کافربووە و دەرچووە لەئیسلام وە کردەوەکانی پوچەڵ بونەتەوە هەروەك الله تعالی فەرموویەتی: {وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ} [الأنعام : 88]

واتە: ئەگەر ئەو پەیامبەرانە هاوبەشیان بۆ الله بڕیاربدایە ئەوا هەرچی کاروکرداریان هەبایە پوچەڵمان دەکردەوە.

دووەم: بریتیە لە دەرخستنی گوێڕایەڵی و موافەقەکردنی موشریکەکان لەسەر دینەکەیان بەڵگەش وتەی الله یە کە فەرموویەتی: {إِنَّ الَّذِينَ ارْتَدُّوا عَلَىٰ أَدْبَارِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْهُدَى ۙ الشَّيْطَانُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ (25) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا لِلَّذِينَ كَرِهُوا مَا نَزَّلَ اللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ ۖ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ (26) فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ (27) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ} [محمد : 25-28]

واتە: بێگومان ئەو کەسانەی مورتەدبونەوە لەئیسلام لە پاش ئەوەی هەقیان بۆ ڕوون بوویەوە شەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان و ڕازاوە کردبوون وە بەهیواو ئومێد فریوی دابوون. چونکەئەوان دەیان وت بەو کەسانەی کە ڕقیان بوو لەو قورئانەی الله ناردبووی وتیان ئێمە لەمەولا لە هەندێ کاردا گوێڕایەڵیتان دەکەین وە بێگومان الله بە نهێنیەکانیان دەزانێت.

ئاخۆ چۆن بێ (حاڵی ئەو مورتەدانە) کاتێ فریشتەکان گیانیان دەکێشن و لە ڕوخسارو پاشیان دەدەن.

ئەو (جۆرە گیان کێشانە) لەبەر ئەوەیە کە بێگومان ئەوانە شوێن شتانێ کەوتبوون کە الله ـی توڕەکردبوو ڕەزامەندی الله ـشیان پێ ناخۆش بوو بۆیە الله ـش کردەوەکانیانی پووچەڵ کردەوە.

**وە شێخی فەقیهـ سولەیمان کوڕی شێخ عبدالله محمد بن عبدالوهاب لەسەر ئەم مەسەلەیە بیست ئایەتی باسکردووە لەکتێبی الله وە چەندان فەرمودەی رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وە کردوویەتی بەبەڵگە کە ئەگەر موسڵمان**

**گوێڕایەڵی و موافەقەی موشریکان بکات بەبێ زۆرلێکردن ئەوا بەو موافەقەکردنەی موڕتەدئەبێت و دەردەچێت لەئیسلام ئەگەرچی شایەتومانیش بهێنێت وە پێنج ئەرکانەکەش جێبەجێ بکات هیچ سودی بۆی نابێت.**

**وە شێخی ئیسلام و پێشەوای بانگەوازی حەنیف(محمد بن عبدالوهاب) لەوتەکەیدا لەسەر کۆتایی سوڕەتی الزمر فەرمویەتی ئەگەر موسڵمان گوێڕایەڵی بکات لەڕووکەشدا بۆ کافران کافردەبێت ئەگەرچی لەناخیشەوە باوەڕداربێت چونکە کافرانی قوڕەیش ئەوەیان لەپێغەمبەر نەویست کە باوەڕی دڵی بگۆڕێت.**

**جائەمە ڕونکرەوەی تێدایە بۆ زۆرێك لەوانەی تێدەکەون کەخۆشیان داوەتە پاڵ ئیسلام کەچی موافەقە و ڕازیبوون بۆموشریکان دەردەبڕن وە ئەوکارەش بەهۆی ترسانیان لەکافرانە وادەزانن بەو موافەقەکردنە کافرنابن مادام لەدڵەوە ڕقیان لەکافران بێت.**

**جا شێخ محمد فەرمووی:**

**ئەوەی موسڵمان پێی کافرئەبێت تەنها باوەڕی دڵ نیە چونکە ئەوانەی الله باسیانی کردووە نەیان دەویست کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەقیدەی خۆی بگۆڕێ هەروەك باسکرا بەڵکو ئەگەر موسڵمان گوێڕایەڵیان بکات لەپێناو ماڵەکەی یان وڵاتەکەی یان خێزانەکەی وە بشزانێت ئەوانەی ئەو ڕازیبوون و موافەقەی بۆیان دەربڕیوە بزانێ ئەوانە کافرن و ڕقیشی لێیان بێت ئەوا خۆیشی کافرە بەهۆی (دەربڕینی گوێڕایەڵی بۆیان) ئیللا کەسی زۆرلێکراو نەبێت.**

تائەو کاتەی شێخ فەرمووی رحمه الله: بەڵام ڕەحمەتی الله لەوکەسەی لەنهێنی وتە تێدەگات کەئەویش مانای ئەو ئایەتەیە کەدابەزی کە موسڵمان لەڕووکەشدا پەسەندی شتێك لەبەرنامەی کافران دەکات بەڵام لەدڵەوەش پێچەوانەی ڕووکەشەکەیەتی جا ئا ئەمەبوو کەکافران دەیانویست

پێغەمبەر ئەنجامی بدات (صلى الله عليه وسلم) جا تێبگە لەمە بە تێگەشتنێکی چاك لەوانەیە خۆت شتێك بزانیت لەدینی إبراهيم عليه السلام کە دەستی کرد بەدوژمنایەتی باوك و گەلەکەی خۆی.

وە شێخ لەباسی سورەتی کەهف نۆیەم ئایەت فەرموویەتی:

بابەتێکی گەورەیە بۆتە کێشە بۆ زۆرێك لەخەڵکی کە ئەگەر موافەقەی کافران بکات بەزمانی لەکاتێکدا بەڕاستی ئیمانداریشە وە حەزیش ناکات کەموافەقەی کافرانی کردوە (لەلای خەڵک ئەوکەسە بەموسڵمان دائەنرێت بەڵام لەشەرعدا ) ئەو کەسە درۆی کردووە لەوتنی لا إله إلا الله وە لەگەڵ الله پەرستراوێکی تری بڕیارداوە جا زۆر خەڵك بەم باسە نەزانن و بێئاگان لێی.

ئەگەر یەکێ لەوان موافەقەی(بەرنامەی) حاکم بکات لەوەی کە دەیانەوێت لەڕووکەشدا لەهەمان کاتیشدا ڕقیشی لێیان بێت(لەناخەوە) ئەوە مانای وتەی الله ـیە {شططا} والشطط: کوفرە (واتا بەوشێوەیەش هەر کافرە).

وەچاکیش بزانە دەربڕینی موافەقە و گوێڕایەڵی بۆ موشریکان چەندین جۆر و حاڵەتی هەیە کە لەمەسەلەی سێیەم باسی دەکەین، إن شاء الله تعالى.

سێیەم شت کەموسڵمان پێی لەدین هەڵدەگەڕێتەوە بریتیە لە: دۆستایەتی و موالاتی موشریکان(هاوبەشدانەران) بەڵگەش وتەی الله تعالى ـیە کە فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ} [المائدة : 51]

واته: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی الله هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

وە وتەی الله تعالى کەفەرموویەتی:

{لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ} [آل عمران : 28]

واته: بێگومان باوەڕداران کافران ناکەن بەدۆستی خۆیان لەجیاتی باوەڕداران هەرکەسیش ئەوان بکاتە دۆستی خۆی ئائەوانە هیچ بەشێکیان بۆ نیە لەلای الله.

لەئایەتی یەکەم الله باسی کرد هەرکەس پشتیوانی جوولەکە و گاورەکان بکات ئەویش لەوانە، وە ڕووکەشی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت ئەوەی پشتیوانیان بکات وەك ئەوان کافرە.

شێخ الاسلام ابن تیمیە مانای ئایەتەکەی بەم شێوەیە باسکردووە رحمە الله.

وە وتەکەی عبد الله بن عتبة باسکرا لەبارەی ئەو ئایەتەی کە الله تعالى فەرمویەتی {ومن یتولهم منکم فإنه منهم}

هەرکەس لەئێوە پشتیوانیان لێ بکات ئائەو کەسەش هەرلەوانە وحسابی ئەوانی بۆ دەکرێت.

لەتەفسیری ئەم ئایەتە فەرموویەتی: با هەریەکێ لەئێوە بترسێت کە ببێتە جولەکە یان گاور بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات .

ابن جریر لەتەفسیری ئایەتی: {فلیس من الله في شيء}

فەرموویەتی: ئەوکەسەی پشتیوانی ئەوان بکات هیچ بەشێکی بۆنیە لەلای الله، فەرمویەتی واتا الله بەریئە لەوکەسە بەهۆی مورتەدبونەوەی لەدینەکەی الله .

وە مانای ئایەتی {إلا أن تتقوا منهم تقاة} وەك ئایەتی {إلا من أکره} وایە، ڕونکردنەوەکەی لەدواتردا باس دەکەین إن شاء الله تعالى.

چوارەم شت: بریتیە لەدانیشتن لەگەڵ موشریکان لەدانیشتنە شیرکیەکانیان بەبێ ئینکاری کردن لێیان بەڵگەش وتەی الله ـیە کە فەرموویەتی: (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا) [ النساء : 140 ].

واتە: وەبێگومان الله ناردوویەتیە خوارەوە بۆتان لە قورئاندا هەرکاتێك بیستان ئایەتەکانی الله بڕوایان پێ ناکرێت و گاڵتەیان پێ دەکرێت ئەوە دامەنیشن لە گەڵیاندا تا دەچنە ناو باسێکی ترەوە(و باسەکە دەگۆڕن) بێگومان ئەگەر دانیشتن لە گەڵیاندا(و هاوبەشیان بکەن) ئەوە ئێوەش وەک ئەوانن بەڕاستی الله کۆکەرەوەی دووڕووەکان و بێ باوەڕەکانیشە بە تێکڕا لە دۆزەخدا.

وە لەوەڵامی پرسیارێکیشدا کە لەکەسوکاری شێخ محمد کراوە بەر ڕەحمەتی الله بکەون کاتێ پرسیاریان لێکرا لەبارەی ئەو ئایەتەو ئەوفەرمودەیەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کەفەرمویەتی (هەرکەس کۆبێتەوە لەگەڵ موشریك و نیشتەجێ بێت لەگەڵیدا ئەویش وەك ئەو موشریکەیە)

آل شیخ لەوەڵامدا فەرمویانە ئایەتەکە لەسەر ڕووکەشەکەیەتی ئەویش ئەوەیە ئەگەر پیاوێك بیستی ئایەتەکانی خوا کوفری پێ ئەکرێت و گاڵتەی پێ ئەکرێت ئەویش دانیشێت لەلای کافران وگاڵتەکەران بەئایەتەکانی خوا ئەوا ئەویش کافرە وەك ئەوان ئەگەر زۆرلێکراو نەبێت و ئەگەر باسەکەیان لێ نەگۆڕێ بەباسێکی تر ئەوا کافرە وەك ئەوان ئەگەرچی وەك ئەوانیش گاڵتە و کوفرنەکات چونکە دانیشتنەکەی لەگەڵیان بەوشێوەیە بریتیە لەڕازی بون بەکوفر ڕازی بونیش بەکوفر کوفرە.

وەهەر بەوئایەتە وهاوشێوەکانی زانایان کردوویانەتە بەڵگە لەسەرئەوەی ڕازی بون بەتاوان وەك بکەری تاوانەکە ئەگەرچی بشڵێت ئەو بەدڵ ئەوکارەی قبوڵ نیە (ئەوا هەربێ سودە) چونکە حوکم دان بەپێی ڕووکەشە ئەویش ڕووکەشی کوفری دەربڕیوە بۆیە پێ دەبێتە کافر.

وەهەر بەوشێوەیە کاتێ ڕووداوی موڕتەدبونەوە سەری هەڵدا خەڵکێك ئەوەیان پێ ناخۆش بوو بەدڵ هاوەڵان لێیانیان قبوڵ نەکرد بەڵکو حسابی موڕتەدیان بۆهەموویانیان کرد ئیللا ئەوەنەبێت کە بەزمان ئینکاری (لەموڕتەدان وموڕتەدبون) کردبێت.

بەهەمان شێوەش فەرموودەی:(من جامع المشرك وسكن معه فإنه مثله) لەسەر ڕووکەشەکەیەتی ئەویش ئەوەیە ئەوکەسەی دەڵێت موسڵمانم بەڵام لەگەڵ موشریکان ئەبێت لە کۆبوونەوە و وسەرخستن وە وماڵ لەگەڵیان ئەبێت بەجۆرێ موشریکان واحساب ئەکەن کەئەویش لەگەڵ ئەوانە ئەوا ئەویش کافرە وەك ئەوان ئەگەرچی بشڵێت موسڵمانم ئیللا مەگەر دینەکەی دەربخات وپشتگیری موشریکان نەکات وسەریان نەخات.

وە لەم بارەیەوە گفتوگۆکەی خالد و مجاعة دێت کە خالد بەمجاعەی وت ڕازی بونت دەربارەی موسەیلەمەی کەذاب و بێ دەنگ بونت لەسەری دان پێنانە بۆ(موسەیلەمە) تاکۆتایی باسەکە..

وە وتەکەی عبدالله ـی کوڕی عمر وەك باسکرا کەفەرمووی

هەرکەس ماڵ بنیاد بنێت دەوڵەتی موشریکان بەشداری نەورۆز و جەژنەکانان بکات وەخۆی بشوبهێنێت پێیان تادەمرێت ئەوا لەقیامەت لەگەڵیان حەشرئەکرێت

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی:

(وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ)

بەڵام کەسێ دڵی خۆش و شادمان بێت بەکوفر و بێ باوەڕی ئەوە بەر خەشم و قینی خوا کەوتوون و سزای گەورەیان دەبێ.

(ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ)

لەبەر ئەوەی بەڕاستی ئەوانە ژیانی دونیایان لا خۆشەویستر بوو لەژیانی ڕۆژی دوایی وە بەڕاستی الله ڕێنموونی کەسانی بێ باوەڕ ناکات.

**پێنجەم (هەڵوەشێنەرەوە بریتیە لە) : گاڵتەکردن بە الله یان بەکتێبەکەی یان بەپێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم بەڵگەش لەسەرئەوە وتەی الله ـیە:**

**{قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ (65) لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ} [التوبة : 65-66]**

**واتە: پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە الله و ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟!**

**(ئیتر بێ سوودە) پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕبوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو ئەگەر لە دەستەیەکتان خۆش ببین (دوای تەوبەی ڕاستەقینە) دەستەیەکتان هەر ئازار دەدەین (بەهۆی کاری نابەجێیەوە) چونکە بەڕاستی ئەوان تاوانبارو تاوانکار بوون.**

**چاك بزانە گاڵتەکردن دوو جۆرە:**

**یەکەمیان: گاڵتەکردنی ڕوون وەك ئەوانەی کە ئایەتەکەیان لەسەر دابەزی کە وتیان کەسمان نەبینیوە وەك ئا ئەمانە سکیان دەرچوبێت و خاوەنی درۆزنترین زمان بێت وە ترسنۆك بێت لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەدا وەهاوشێوەی ئەوقسانەی گاڵتەکەران کە هەندێکیان دەڵێن**

**دینەکەتان ترشە وە وەك وتەی هەندێکی تریان دەڵێن دینەکەتان سوتاندنە وە وتەی هەندێکی تریان کاتێ یەکێك دەبینێت فەرمان بەچاکە دەکات یان کەسێ دەبینێت نەهی لەخراپە دەکات دەڵێن ئەوە کەڵەشێرەکان هاتن بۆتان( أهل الديك ! بەپیتی کاف لەجیاتی پیتی نون) وە وتەی هەندێکی تریان کاتێك قوتابیەکی فێرخوازی زانستی شەرعی دەبینێت بەگاڵتەوە ناویان دەبات ( پیتی لام لەوشەی طلبة دەکاتە سکون) وە زۆری تریش کە لە ژماردن نایەت کە وتەی ڕوونن و گەورەتریشن لە وتەی ئەوانەی کە ئایەتەکەیان لەسەر دابەزی.**

جۆری دووەم: گاڵتەکردن بەشێوەی ناڕاستەوخۆ ئەمەش دەریایەکە کەناری نیە، وەك ئاماژە کردن بەچاو(داگرتنی چاو لەبەرامبەر ئایەتێك یان فەرموودەیەك یان مەسەلەیەکی شەرعی)، یان دەرکردنی زمان، وە گازگرتن لەلێو یان بادانی دەست (ئاماژەکردنی بەسوك دانان ) لەکاتی خوێندنەوەی قورئان یان سوننەتی رسول الله صلی الله علیه وسلم یان لەکاتی فەرمانکردن بەچاکە و نەهی کردن لەخراپە.

شەشەم: دەرکەوتنی سەخڵەتی و تورەیی لەکاتی بانگەوازکردن بۆ ڕێی الله، وە خوێندنەوەی ئایەتەکانی، وە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە، بەڵگەش لەسەر ئەمە بریتیە لە وتەی الله تعالی کە فەرموویەتی: {وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنكَرَ ۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِالَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا ۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ۗ النَّارُ وَعَدَهَا اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ} [الحج : 72]

واتە: کاتێك کە ئایەتەکانی ئێمە بەڕوونی و ئاشکرایی بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، لە ڕووخساری ئەوانەدا کە بێ باوەڕن بێزاری و تاڵی و گرژی بەدی دەکەیت، بەجۆرێك خەریکە هێرش بەرنە سەر ئەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێننەوە، پێیان بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خراپتر لەو کینەو بوغزەتان؟! ئەویش ئاگری دۆزەخە!! کە الله - تعالی - بەڵێنی داوە بەوانەی کە بێ باوەڕ پێی، ئای کە سەرەنجام و چارەنووسێکی خراپە.

حەوتەم: بوغزاندن و ڕق بوونەوە لەوەی کە الله تعالی دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەکەی لە قورئان و حیکمەت(دانایی یان سوننەت)، بەڵگەش بریتیە لە وتەی الله تعالی کە فەرموویەتی: {بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ} [محمد : 9]

واتە: (ئەمە بەهۆی ئەوەبوو) کە ئەوان ڕقیان لەوەبوو کە الله تعالی دایبەزاندووە، بۆیەش الله کردەوەکانی لێ پوچەڵ کردنەوە.

هەشتەم: ئیقرار نەکردن(باوەڕ نەبوون) بەوەی کە ئایەت و فەرموودەکان ئاماژەیان پێداوە، هەروەها مشتومڕکردن و موجادەلە کردن تیایدا، بەڵگەش لەسەر ئەمە وتەی الله تعالى کە فەرموویەتی: {مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي الْبِلَادِ} [غافر : 4]

واتە: هیچ کەس لە بەرامبەری ئایەت و فەرمانەکانی الله موجادەلە و دەمەدەمێ ناکات، جگە لەوانەی کە بێ بڕواو کافر بوون، ئەی پێغەمبەر (صلى الله علیه و سلم) کەواتە دەسەڵات و سەرمایە و هێزیان فریوت نەدات.

نۆیەم: ئینکاری کردن لە هەندێك یان کەمێك لە کتێبەکەی الله(قورئان)، ئەگەرچی یەك ئایەت یان بەشێکی ئەو ئایەتە بێت، یان هەندێك لەوەی کە پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) هێناویەتی لەگەڵ خۆی، بەڵگەش لەسەر ئەمە بریتیە لە وتەی الله تعالى: {إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا (150) أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا} [النساء : 150-151]

واتە: بێگومان ئەوانەی باوەڕ بە الله و پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بکەن لە نێوان اللهو پێغەمبەرەکانیدا (گوایە باوەڕیان بەالله هەیە بەڵام باوەڕیان بەپێغەمبەران نیە)، (یاخود) دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بەهەندێک لە پێغەمبەران و باوەڕ بەهەندێکیان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەك بۆ خۆیان بەدەست بهێنن...

ئا ئەو کەسانە بەڕاستی هەر بێ باوەڕن(کافرن) و بۆ بێ باوەڕان سزایەکی سەرشۆڕکەرمان ئامادەکردوە..{151}

کە ئەمەش تایبەتترە لەوەی پێش خۆی.

دەیەم: پشتهەڵکردن لەفێربوونی دینی الله و غافڵی و کەمتەرخەمی و (بێئاگایی) لەم شتەدا، بەڵگەش بریتیە لە وتەی الله تعالی: {وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ} [الأحقاف : 3]

واتە: بێگومان کافران(بێباوەڕان) پشت هەڵدەکەن لەوەی کە ئاگادارکراونەتەوە لێی و هەڕەشەیان لێکراوە.

یانزەهەم: ڕق بوونەوە لە هەڵسان و جێبەجێکردنی دین و کۆبوونەوە لەسەری، بەڵگەش لەسەر ئەمە بریتیە لە وتەی الله تعالی کە فەرموویەتی: {شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ ۖ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ۚ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ۚ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ} [الشورى : 13]

واتە: ڕێبازی ئاین و بەرنامەی ژیانی بۆ داناون، ئەوەی کەفەرمانی پێکردووە بە _نوح_، هەر بەوشێوەیە قورئانیشی بۆ تۆ ئەی محمد صلى الله عليه وسلم وەحی و نیگا کردووە و بە ئیبراهیم و موساو عیساشمان ڕاگەیاندووەکە ڕێبازی ئاین و تەنهاپەرستنی الله بەرنەدەن و لەسەری پایادار بن، ئەم بانگەوازە ڕاست و دروستە زۆر بەلای بت پەرست و موشریکانەوە گران و زەحمەتە، بەڵام الله ــ دانا خۆی کەسانی شایستە هەڵدەبژێرێت بۆ گەیاندنی ئاینەکەی ڕێنموویی خەڵکانێك دەکات کە بگەڕێنەوە بۆ لای بەرنامەکەی بەپەرستن و ئەنجامدانی کاروکردەوەی چاك.

لێرەدا باسی کردووە کە جگە لە کەسی موشریك هیچ کەسێکی تر ڕقی لە هەڵسان و جێبەجێکردنی دین نیە، وە پێتشتریش ڕوون کرایەوە کە هەرکەسێك شیرك بۆ الله بڕیاربدات ئەوا کافرە.

دوانزەهەم شت: سیحر و جادوو، فێربوون و فێرکردنی هەروەها کارکردن بەوەی کە لەگەڵ خۆی دێنێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە وتەی الله تعالی ـیە کە فەرموویەتی: {وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ} [ البقرة : 102 ]

واتە: کەسیشیان فێرنەدەکرد(سیحر) مەگەر دوای ئەوە نەبوایە کە پێیان دەوت ئێمە فیتنە و تاقیکردنەوەین بۆیە کوفر مەکە و بێباوەڕ مەبە.

**سیانزەهەم شت: نکۆڵی کردن لەزیندوو بوونەوەی ڕۆژی قیامەت**
**بەڵگەش بریتیە لە وتەی الله تعالی کە فەرموویەتی:**
{وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ}
[الرعد : 5 ]
واتە: جا ئەگەر تۆ سەرت سوڕ بمێنێ ئەوە قسەی ئەوانە جێی سەرسوڕمانە کە دەڵێن ئایا کاتێ کە مردین و زیندوو بووینەوە بە خاك ئایا ئێمە سەر لە نوێ دروست ئەکرێینەوە؟ ئەوانە کەسانێکن کە بێ باوەڕ بوون بە پەروەردگاریان جا ئەوانە کۆت و زنجیر لە گەردنیاندایە وە ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن کە بەهەمیشەیی دەمێننەوە تێیدا.
چواردەهەم شت: بریتیە لە حوکم بردنەوە بۆ جگە لەکتاب وسوننەتی رسول الله (صلی الله علیه وسلم) هەروەك ابن کثیر فەرموویەتی:
هەروەك چۆن خەڵکی جاهیلیەت حوکمیان پێ دەکرد لەگومڕایی و نەزانی کە بە بیروبۆچون و ئارەزووی خۆیان حوکمیان داڕشتبوو وەهەروەك چۆن تەتار حوکمی پێ دەکرد لەسیاسەتی پاشایەتی کە لەپاشاکەیان جەنگیزخانیان وەرگرتبوو کە یاسقی بۆیان داڕشتبوو کە پێکهاتبوو لەکتێبێك کۆمەڵێ یاسای تێدا دانرابوو کە وەرگیرابوو لەکۆمەڵێ یاسای جوولەکە و نەسڕانیەت و دینی ئیسلام و جگە لەوانەش وە زۆربەی یاساکانی وەرگرتبوو بەتەنها بەدید و بۆچون و ئارەزووی

خۆی وە ئەم یاسایەش بووە بەرنامەیەکی پەیڕەولێکراو لەناو نەوەکانیدا وە دەیانخستە پێش حوکم کردن بەکتاب(قورئان) وسونەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جاهەرکەسێ ئەوکارە بکات ئەوە کافرە واجبە جەنگ دژی بکرێت تا دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی الله و ڕەسولەکەی وەتاکو حوکم بەغەیری شەرعی الله نەکات نە لەکەم و نە لەزۆر..
الله تعالی فەرموویەتی: {أفحکم الجاهلیة یبغون ومن أحسن من الله حکما لقوم یوقنون}.
ئایا ئەوانە یاسای نەفامییان دەوێت ئایا کێ هەیە حوکمەکەی وەك حوکمی الله چاك وباش بێت بۆگەلێك کە یەقین و دڵنیاییان هەبێت.

منیش دەڵێم ئەمە هاوشێوەی ئەوەیە کە دەشتەکیەکان وهاوشێوەکانیان تێی کەوتوون لەحوکم کردنیان بەنەریتی باپیرانیان وە بەوەی کە پێشینەکانیان بۆیانیان داناوە لەویاسا نەفرەتیانە وە ناویان لێ ناوە (یاسای رفاقە) وە دەیخەنە پێش کتاب(قورئان) و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) وە هەرکەسێ ئەو کارە بکات کافرە کوشتنی واجبە تادەگەڕێتەوە بۆ لای حوکمی الله و ڕەسولەکەی (صلی الله علیە وسلم).

وەشیخ الاسلام ابن تیمیە رحمە الله فەرموویەتی:

(هیچ گومانی تێدانیە ئەوکەسەی باوەڕی بەواجب بونی حوکم کردن نەبێ بەوەی الله دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی صلی الله علیە وسلم ئەوکەسە کافرە

وە هەرکەسێك ڕێگەبدات حوکم بکرێ لەنێوان خەڵکی بەشتێك کە خۆی بەدادوەری دەزانێت ئەوا کافرە

وە هیچ گەلێك نیە ئیللا فەرمان بەدادوەری دەکات وە دادوەری لای ئەوان بریتیە لەو (یاسایانەی) کە گەورەکانیان (وەك یاسا) دەیبینن.

وە زۆرێك لەخەڵکی کە خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام حوکم بە نەریتێك دەکەن کە الله داینەبەزاندووە وەك عادەتی دەشتەکیەکان وە فەرمانی گوێڕایەڵ بۆکراوەکان(پیاو و سەرکردەکانیان)، وە وای دەبینن پێویستە حوکم بەوە بکرێ لەجیاتی قورئان وسوننەت ئەمەش کوفرە.

وە ئەوانە ئەگەر زانیان دروست نیە حوکم بکرێ ئیللا بەوە نەبێ کە الله دایبەزاندووە بەڵام پابەند

نەبوون و ڕێگەیان دا کە حوکم بە پێچەوانەی دابەزێنراوەکەی الله بکەن ئەوا کافرن وە حوکم کردن بەوەی کە الله دایبەزاندووە واجبە لەسەر پێغەمبەر و شوێنکەوتووانی (صلی الله علیە وسلم) وە هەرکەسێ پابەند نەبێت بەحوکمی الله و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیە وسلم ئەوا کافرە

**شێخ ئەوەی وتووە لە (منهاج السنة النبوية) وە باسی کردوە لەتەفسیری ئایەتی {ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون} هەرکەسێك حوکم نەکات بەوەی کە الله دایبەزاندووە ئا ئەوانە بێ باوەڕن.**

**ڕەحمەتی الله لێی بێت و الله لێی خۆش بێت.**

**ئەمانە هەندێ بابەت بون کە قورئان بەڵگەیە لەسەری، وە ئەگەر وترا: بەڵام باسکردنی هەندێکیان تەواوە و بەسە لەوەی باسی هەندێکی تر بکرێت و یاخود ئەوەی تر دەکەوێتە ژێر ئەمەش، - ئەوا دەڵێین - : بەڵام باسکردنی بەو شێوەیە ڕوونترە، وە وتەی زانایان لەم بارەیەوە زۆرە رحمهم الله، وە خاوەنی الاقناع هەندێ شتی زۆری باس کردووە لە باسی موڕتەد کە ئەوەیە لەدوای موسڵمان بوونی کافردەبێتەوە، وە منیش هەڵسام بە کورتکردنەوەی چەندین بابەت لێی.**

**لەوانەش وتەکەی کە فەرموویەتی: شێخ دەفەرمووێت: یاخود ڕقی لە پێغەمبەرکەی بێت یاخود لەوەی کە هێناویەتی ئەوا بە ڕێکەوتن( ئیتیفاقی زانایان) کافردەبێتەوە، هەروەها وتەکەی: یاخود لەنێوان خۆی و الله واستە و نێوان دابنێت کە پشتیان پێ ببەستێت و داوایان لێبکات ئەوا کافرە بەئیجماع(کۆڕا)، هەروەها وتەکەی: یاخود بینرا لێی کە سوکایەتی بەقورئان دەکات، واتە: بەو شتە کافردەبێتەوە، هەروەها وتەکەی: یاخود گاڵتە بکات بە وەعد و بەڵێن و هەڕەشەکانی الله، واتە: بەوە کافردەبێتەوە، هەروەها وتەکەی: یاخود تەکفیری کەسێك نەکات کە لەسەر دینێکی تر بێت غەیری دینی ئیسلام، یاخود گومان لە کوفریان بکات، واتە: کافردەبێتەوە بەوە، هەروەها لەمەشدا وتەکەی کە فەرموویەتی: شێخ فەرموویەتی: وە هەرکەسێك حەشیش(ماددەی بێهۆشکەر) بە حەڵاڵ بزانێت ئەوا کافرە بەبێ هیچ ڕاجیایی و ململانێیەك.**

**گوتم: هەرکەسێك دۆستایەتی و موالاتی موشریکان و یارمەتیدانیان لەدژی موسڵمانان بە حەڵاڵ بزانێت ئەوا کوفرەکەی گەورەترە لە کوفری ئەمە، چونکە حەڕامبوونی ئەمە دڵنیاتر و توندترە لە حەڕامبوونی حەشیش.**

هەروەها لەوەشدا وتەکەی: هەرکەسێك جنێو بە هاوەڵان یان یەکێك لە هاوەڵان بدات، هەروەها لەگەڵ جنێودانەکەی ئەوەشی پێ ببەستێتەوە کە عەلی پەروەردگار یان پێغەمبەر بێت، وە جبرائیل هەڵەی کردبێت، ئەوا گومان لەکوفری ئەمەدا نیە، بەڵکو گومانیش نیە لەکوفری ئەو کەسەی کە دەوەستێت لە تەکفیرکردنی.

هەروەها وتەکەی: یاخود وای دابنێت کە قورئان مانای شاراوەی هەیە بەهۆیەوە کاروکردەوە شەرعیەکان لادەبات، یاخود شتی لەم شێوەیە، جا خیلاف و ڕاجیایی نیە لەکوفری ئەمانە.

هەروەها لەمەشدا وتەکەی: یاخود وای دابنێت کە هاوەڵان دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەڵگەڕاونەتەوە تەنها چەند نەفەرێکی کەم نەبن کە ناگەنە چەند کەسێك زیاتر لە دە، یاخود ئەوان توشی خراپەکاری(فسق) بووبن، ئەوا بەهەمان شێوە گومان نیە لەکوفری ئەو کەسەی کە ئەم شتە دەڵێت، بەڵکو هەرکەسێك گومان لەکوفرەکەی بکات ئەوا کافردەبێتەوە، بەکورتی ئەمە تەواو بوو، دواتر دەیگێڕێتەوە بۆ کتێبی الصارم المسلول.

هەروەها وتەکەی کە فەرموویەتی: وە هەرکەسێك ئینکاری بکات لەوەی کە ئەبوبەکر هاوەڵی پێغەمبەر بێت(صلى الله عليه وسلم) ئەوا کافرە، ئەمەش لەبەر وتەی الله تعالى: { إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ } واتە: بە هاوەڵەکەی خۆی فەرموو..

گوتم: جا ئەگەر ئینکاری کردن لە دەلالەت و مانای یەك ئایەت کوفر بێت و هەردوو شایەتومانەکەو خۆدانەپاڵ ئیسلام(انتساب) سودی پێ نەگەیەنێت کەواتە ئەی گومان چی بێت سەبارەت بەو کەسەی کە ئینکاری لە مانای سی یان چل ئایەت دەکات، ئایا ئەو کەسە نابێتە کافر و هەردوو شایەتومانەکە و خۆدانەپاڵ ئیسلام سودی بۆ نابێت !؟ بەڵێ سوێند بە الله، بەڵێ سوێند بە الله.

بەڵام پەنا بە الله دەگرین لە ژەنگ هێنانی دڵ و لاڕێچوونی، وە ئارەزووی نەفس کە ڕێگادەگرێن لە ناسینی حەق و شوێنکەوتنی.

لەمەشدا وتەکەی: یاخود ئینکاری بکات لە حەڵاڵ بوونی نان و گۆشت و ئاو، واتە: بەوە کافر دەبێت.

**هەروەها وتەکەی: یاخود زینا(داوێن پیسی) و شتی هاوشێوە بەحەڵاڵ بزانێت، واتە: بەوە کافر دەبێت.**

**گوتم: وە هەرکەسێك چوون بەلای کافران بە حەڵاڵ بزانێت، هەروەها سۆزداری و نەرم ونیانی لەگەڵ موشریکان، ئەوە کوفرەکەی گەورەترە بەچەندین هاوشێوە لە کەسێك کە زینا حەڵاڵ بکات.**

**هەروەها وتەی زانایان لەم بابەتە ناتوانرێت حیساب بکرێت، تەنانەت هەندێکیان شتی وایان باسکردووە کە ئاسانتر و سوکترە لەم شتانە، وە حوکمیان داوە بە هەڵگەڕانەوە و موڕتەد بوونەوەی ئەنجامدەرەکەی لە ئیسلام وە دەبێت استتابەی بکرێت(تەوبەی پێ بکرێت)، ئەگەر تەوبەی کرد ئەگەرنا دەکوژرێت بەهۆی موڕتەد بوونەوەی، وە ناشۆردرێت و نوێژی لەسەر ناکرێت و لەگەڵ موسڵمانان نانێژرێت، کە ئەو لەگەڵ ئەمەشدا دەڵێت: لا إله إلا الله، وە پێنج ئەرکانەکەی ئیسلامیش بەجێ دەهێنێت.**

**وە هەرکەسێك کەمترین سەرنجی هەبێت بۆ وتەی ئەهلی عیلم و زانست ئەوە بێگومان دەبێت هەندێك لەمەی پێ گەیشتبێت.**

**ئەما ئەو شتانەی کە لەم سەردەمە لەلایەن زۆرێك لەوانە ڕوودەدات کە خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام، بەڵکو تەنانەت لەلایەن زۆرینەی ئەوانەی کە دراونەتە پاڵ عیلم و زانست کە هەموو ئەو شتانە پشت شکێنن، وە زۆربەشیان گەورەتر و پۆخڵترن لە زۆربەی ئەو شتانەی کە زانایان باسیان کردووە لەو شتانەی کە خاوەنەکەی پێ کافردەبێتەوە، خۆ ئەگەر دەرکەوتنی جەهل و نەزانی و ونبوون و شارانەوەی عیلم و زانست و زاڵبوونی هەوا و ئارەزوو نەبێت ئەوا زۆربەی خەڵك پێویستی بەوە نەدەبوو کە ئاگادار بکرێنەوە و پێیان ڕابگەیەندرێت.**

## بەشێك

## دەربارەی ئەو شتانەی کە مرۆڤ تیایدا عوزر و بیانووی هەیە کە موافەقە و هاوشێوەی موشریکان بکات

ئەما مەسەلەی سێیەم: بریتیە لەو شتانەی کە مرۆڤ تیایدا عوزر و بیانووی هەیە کە موافەقە و هاوشێوەی موشریکان بکات، وە گوێڕایەڵی دەربخات بۆیان، ئەمەش سێ حەڵەتی هەیە:

حاڵەتی یەکەم: ئەوەیە کە بە ڕواڵەت و بەناخ هاوشێوەیان بکات و بە ڕووکەش شوێنیان بکەوێت، وە مەیلی بەلایاندا بڕوات و بەناخ نەرم و نیان بێت لەگەڵیان، ئەمەش کافرەو لە ئیسلامدا بەدەرە، جیاوازیشی نیە ئایا زۆرلێکراوە لەسەر ئەم شتە یان نا، ئەویش لەو کەسانەیە کە الله تعالى دەربارەیان فەرموویەتی: (وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) [ النحل : ١٠٦ ] واتە: بەڵام ئەو کەسەی دڵی بە کوفرو بێ دینی خۆش کردبێت، ئەوانە خەشم و قینی اللّه ـیان لەسەرەو سزای گەورەو سەخت و دژواریان بۆ هەیە.

حاڵەتی دووەم: ئەوەیە کە موافەقەیان بکات و بەناخ مەیلی بڕوات بەلایاندا، کە ئەمەش دوو ڕواڵەت دەگرێتەوە:

یەکەم: ئەم شتە بکات بەهۆی ئەوەوەی کە لەژێر دەسەڵاتی ئەواندایە، لەگەڵ لێدان و قۆڵبەست کردنیان بۆی، یاخود هەڕەسەی کوشتنی لێبکەن، پێی بڵێن: یان ئەوەتا موافەقەی ئێمە دەکەی و ڕازیبوون و شوێنکەوتنت بەئاشکرا بۆ ئێمە دەردەخەی، ئەگەرنا دەتکوژین، جا ئەو کەسە لەو حاڵەتەدا بۆی هەیە بە ڕواڵەت هاوشێوەیان بکات لەگەڵ ئەوەش دەبێ دڵی بە ئیمان ئارام بێت، هەروەك ئەمە بەسەر عەممار ڕوویدا کاتێك الله تعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند: (إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ) واتە: تەنها ئەو کەسە نەبێت کە زۆرلێکراو بێت لەکاتێکدا دڵی بە ئیمان ئارام بێت.

وە هەروەك الله تعالى فەرموویەتی: (إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً) واتە: مەگەر لەبەر ئەوەی خۆتان بە بێگومان لە شەڕیان بپارێزن و قوتاربن.

جا ئەم دوو ئایەتە هاوڕێکن هەروەك ئەبن کەثیر لە تەفسیری سوڕەتی آل عمران باسی کردووە.

ڕواڵەتی دووەم: لە ڕووکەشدا موافەقەیان بکات بەڵام لەناخدا پێچەوانەیان بکات، لەکاتێکدا ئەو کەسە لەژێر دەسەڵاتیاندا نەبێت، بەڵکو ئەوەی وای لێکردبێت وابکات ئەوەیە کە چاوتێبڕینی هەبووبێت بۆ ماڵ و سەرۆکایەتی، یاخود خۆبەستنەوە بە نیشتیمان و خێزان، یاخود ترسان لەوەی کە لەداهاتوو شتێك ڕووبدات، جا ئەم کەسە لەم حاڵەتەدا هەڵگەڕاوەیە لە دین ( موڕتەدە )، ڕق لێبوونەوەش بەناخ هیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت، ئەو لەو کەسانەیە کە الله تعالى دەربارەیان فەرموویەتی: (ذَلِكَ بِأَنَّهُمُ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ) واتە: ئەو خەشم و قینەش لەبەر ئەوەیە چونکە بەڕاستی ئەوانە ژیانی دنیایان خۆش ویستووە تا ژیانی دوارۆژ، بێگومان خوا هیدایەتی قەوم و کەسانی بێ باوەڕو خوا نەناس نادات.

لێرەدا هەواڵی داوە کە ئەوان لەبەر ئەوە توشی کوفر نەبوون بەهۆێ ئەوەی ڕقیان لەحەق بێت یان حەقیان نەناسیبێت، هەروەها خۆشەویستی ناحەق(باتڵ)ـیش وای لێ نەکردوون، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەوان بەهۆی ئەوەوە بەشێك لە ماڵی دونیایان دەست دەکەوێت، لەئەنجامدا هەڵیانبژارد بەسەر دین.

کە ئەمەش مانای قسەکانی شێخ محمد کوڕی عبد الوهاب ـە رحمه الله.

ئەما زۆربەی ئەو شتانەی کە خەڵك پێیان وایە دەبێتە عوزر و بیانوو، ئەوقە بەڕاستی جوانکاری شەیتانە بۆیان و ئەمەی لەلایان خۆشەویست کردووە، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە هەندێکیان ترسێنران لەلایەن دۆست و ئەولیاکانی شەیتان بە شێوازێك کە ئەو ترسە حەقیقەت و ڕاستەقینەیی نەبێت، وا گومان دەبات کە بەهۆی ئەمە جائیزە بۆی موافەقە بۆ موشریکان دەربخات و شوێنیان بکەوێت.

وه هەندێکی تریان وا گومان دەبەن کە ئەگەر شەیتان تەماحێکی دونیایی بۆ ڕازاندەوە ئەوا بۆی هەیە موافەقەی موشریکان بکات لەسەر ئەمە، هەروەها سەر لە ژەسانی جاهیل و نەزان شێوێنراوە گوایە ئەمە زۆرلێکراوە(مکرهـ)، لەکاتێکدا زانایان چۆنیەتی ئیکراهیان باس کردووە.

شیخ الاسلام فەرموویەتی: سەرنجی ڕێبازەکانم دا، بینیم کە زۆرلێکردن(ئیکراهـ) دەگۆڕێت بەپێی جیاوازی زۆرلێکراو، جا زۆرلێکردنی ڕاست و دروست(المعتبر) لە وتنی وتەی کوفر وەکو زۆرلێکردنی موعتبەر نیە لە هیبەت(بەخشین) و شتی لەم شێوەیە، چونکە ئەحمەد لە چەندین شوێن وتوویەتی کە زۆرلێکردن بۆ وتنی وشەی کوفر نایەتە جێ مەگەر تەنها بە ئەشکەنجەدان نەبێت وەك لێدان یان قۆڵبەست کردن، هەروەها قسە نابێتە زۆرلێکردن، هەروەها وتوویەتی ئەگەر ئافرەت مارەیی خۆی بدات بە پیاوەکەی لەبەر نیشتەجێ بوونەکەی ئەوا بۆی هەیە بگەڕێتەوە، ئەمەش بەپێی ئەوەی کە ئەو ئافرەتە ئەو بەخششەی پێنادات تەنها لەترسی ئەوە نەبێت کە تەڵاقی بدات، یاخود خراپ بێت لەگەڵی، لێرەدا ترسان لە تەڵاق و خراپی ژیان لەگەڵدا کردنی کردووە بە ئیکراهـ(زۆرلێکردن)، وە لە شوێنێکی تر بە دەربڕینێکی تر فەرموویەتی: (چونکە زۆری لێکردووە)، وە هاوشێوەی ئەمە نابێتە ئیکراهـ لەسەر کوفر، چونکە کەسی دەستگیرکراو(ئەسیر) ئەگەر ترسا لەوەی کافران لێنەگەڕێن هاوسەرگیری بکات یاخود لە ئافرەتەکەی جیای بکەنەوە بۆی نیە وتەی کوفری بڵێتەوە..اهـ

مەبەستیش لەمە: زۆرلێکردن(ئیکراهـ) لەسەر کوفر نایەتە جێ مەگەر تەنها بە ئەشکەنجەدان نەبێت:

وەك لێدان یان قۆڵبەست کردن، هەروەها قسەکردن(هەڕەشە کردن بە قسە) نابێتە زۆرلێکردن، بەهەمان شێوە ترسان لەوەی کە کافران لە هاوسەرەکەی جیای بکەنەوە نابێتە زۆرلێکردن، جا ئەگەر ئەمەت زانی و هەروەها ئەوەشت زانی کە زۆر لە خەڵکی ئێستا تێی کەوتوون ئەوا لێرەدا فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕوون دەبێتەوە بۆت: ( ئیسلام بەنامۆیی دەستی پێکرد و دەگەڕێتەوە بۆ نامۆییەکەی وەك چۆن – بەنامۆیی - دەستی پێکرد )، جا بەڕاستی ئیسلام نامۆ بۆتەوە، نامۆتر لەمەش ئەوەیە کە کەسێك حەقیقەتی ئەم شتە بزانێت..وبالله التوفيق

## بەشێك

## مەسەلەی دەرخستنی دین ( إظهار الدين )

ئەما مەسەلەی چوارەم: بریتیە لە مەسەلەی دەرخستنی دین، چونكە زۆرێك لەخەڵك وایان زانیوە كە ئەگەر بتوانێت هەردوو شایەتومانەكە بڵێتەوە و نوێژبكات و واز لە مزگەوت نەهێنێت( بەردەوام بڕوات) ئەوا دینی خۆی دەرخستووە ئەگەرچی لەنێو موشریكانیش بێت !، یاخود لە نیشتنگەكانی مورتەدان بێت، كە بەڕاستی لەمەشدا هەڵەیان كردووە بە پۆخڵترین هەڵە.

بزانە كە كوفر شێواز و بەشی جیاجیای هەیە و زیاد دەبێت بەپێی زیادبوونی كوفرەكان، لە پێشدا باسی هەندێكیش لەمەمان كردووە، وە هەر دەستەیەك لە دەستەكانی كوفر بێگومان ئەبێ جۆرێك لەو كوفرە بەناوبانگ بێت لەلای، وە موسڵمان دینی خۆی دەرنەخستووە تا ئەوكاتەی پێچەوانەی هەر دەستەیەك دەكات لەوەی كە بەناوبانگ بووە لای، وە بەئاشكرا دوژمنایەتیان بكات و بەڕائەتیان لێبكات، جا هەركەسێك كوفرەكەی بریتی بێت لە شیرك ئەوا دەرخستنی دین لەلایدا ئەوەیە كە تەوحید دەربخات یاخود نەهی كردن و ئاگاداریدان لە شیرك، وە هەركەسێك كوفرەكەی بریتی بێت لە ئینكاری كردن و جحود لە ڕیساله(پەیام) ئەوا دەرخستنی دین لەلایدا ئەوەیە كە بەئاشكرا - باس لەوە بكات - كە محمد(صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەری الله ـیە و بانگەواز بۆ شوێنكەوتنی بكات، وە هەركەسێك كوفرەكەی بریتی بێت لە وازهێنان لە نوێژ ئەوا دەرخستنی دین لەلایدا ئەوەیە كە نوێژ ئەنجام بدات و فەرمانی پێ بكات، وە هەركەسێك كوفرەكەی بریتی بێت لە دۆستایەتی و موالاتی موشریكان و چونە ژێر ڕكێفیان ئەوا دەرخستنی دین لەلایدا ئەوەیە كە بەئاشكرا دوژمنایەتی بكرێت و بەڕائەت بكرێت لەخۆی و لەموشریكان.

وە بەگشتی هیچ كەسێك دینی خۆی دەرنەخستووە تا ئەوكاتەی بە ئاشكرا بەڕائەت دەكات لەو كافرانەی كە لەگەڵیاندا نیشتەجێیە، وە دوژمنایەتی دەربخات بۆ ئەو شتەی كە بەهۆیەوە كافربۆتەوە وە بەڕائەتی لێبكات.

هەر بۆیەش موشریكان فەرموویانە بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) : (دینەکەی ئێمەی عەیبدار کرد، وە خەونەکانی ئێمەی پوچەڵ و بێ کەڵك کرد، وە جنێوی دا بە پەرستراوەکانی ئێمە).

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي شَكٍّ مِّن دِينِي فَلَا أَعْبُدُ الَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ اللَّهَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (104) وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (105) وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ الظَّالِمِينَ} [يونس : 104-106]

واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لە ئاین و بەرنامەی من، ئەوە چاك بزانن کە: من هەرگیز ئەو شتانە ناپەرستم کە ئێوە لە جیاتی الله دەیانپەرستن، بەڵکو ئەو پەروەردگارە دەپەرستم، کە مردنی ئێوەی بەدەستە و من فەرمانم پێدراوە کە لە دەستەی باوەڕداران بم.

هەروەها فەرمانم پێدراوە کە بەڕاست و ڕەوان ڕووت بکەرە ئاین و دینداری بەوپەڕی ملکەچی و دڵسۆزیەوە، هەروەها فەرمانم پێدراوە کە: نەکەیت لە دەستەی موشریک و هاوەڵگەڕان بیت.

هاناو هاواریش نەبەیت بۆ کەسێك یان شتێك لە جیاتی الله، کە نە قازانجت پێ دەگەیەنێت نە زیان (چونکە قازانج و زیان هەر بەدەست الله ـیە)، خۆ ئەگەر کاری وا ئەنجام بدەیت، ئەوە بەڕاستی تۆ لە ستەمکارانیت.

جا الله تعالی فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە کە پێیان بڵێت: (ئەی خەڵکینە)... تاکۆتایی، واتە: ئەگەر گومانتان کرد لەو دینەی کە من لەسەریم، ئەوا ئەو دینەی کە ئێوە لەسەرین من لێی بەریئم، وە بەڕاستی پەروەردگارم فەرمانی پێکردووم کە من لەو ئیماندارانە بم کە دوژمنی ئێوەن، وە قەدەغەی کردووم لەوەی لە موشریکان بم کە دۆست و هاوەڵی ئێوەن.

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ (1) لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ (2) وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ } [الكافرون : 1-3] تا کۆتایی سورەتەکە

**واتە: بڵێ: ئەی کۆمەڵی بێباوەڕ و کافران، من ئەوە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن، وە ئێوەش ئەوە ناپەرستن کە من دەیپەرستم.**

**جا الله تعالى فەرمانی کردووە بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە بە کافران بڵێت: ئەو دینەی کە ئێوە لەسەرین من لێی بەریئم، وە ئەو دینەی کە من لەسەریم ئێوە لێی بەریئن، مەبەستیش: ئاشکرا کردن بۆیان بەوەی کە ئەوان لەسەر کوفرن، هەروەها کە ئەو بەریئە لەخۆیان و دینەکەیان.**

**جا هەرکەسێك شوێن پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کەوتبێت ئەوا لەسەریەتی کە ئەمە بڵێت، وە دینی خۆی دەرنەخستووە مەگەر تەنها بەمە نەبێت، جا لەبەر ئەمەش کاتێك هاوەڵان کردەوەیان بەمە کرد و موشریکان ئەشکەنجەیان دان پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردن کە هیجرەت(کۆچ) بکەن بەرەو حەبەشە، خۆ ئەگەر ڕوخسەت و دەرفەتێکی بۆیان بدۆزیبایەوە تاکو بێدەنگ بن لە موشریکان ئەوا فەرمانی پێ نەدەکردن کە بڕۆن بەرەو وڵاتی نامۆیی و غوربەت.**

**وە لە ژیاننامە(سیرە) هاتووە کە خالیدی کوڕی وەلید کاتێك چوو بەرەو ناوچەی العرض - لەکاتی چوونی بەرەو یەمامە کە لەدین هەڵگەڕابوونەوە - هەڵسا بە پێشخستنی دووسەد سوارچاك، وە فەرمووی: هەرکەسێکتان دەست پێگەیشت لە خەڵك ئەوا بیگرن، ئەوانیش مەجاعەیان گرت، لەنێو بیست و سێ پیاو لە خەڵکی قەومەکەی، جا کاتێك گەیشت بە خالید پێی وت: ئەی خالید، خۆ تۆ بەڕاستی زانیوتە کە من هاتم بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وە بەیعەتم پێی دا لەسەر ئیسلام، وە من ئەمڕۆ هەر لەسەر ئەوەم کە دوێنێ لەسەری بووم، جا ئەگەر درۆزنێك هەبێت ئەوا لەناومان دەرچووە چونکە الله تعالى فەرموویەتی: ( وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ) واتە: کەس تاوانی کەسی تر هەڵناگرێت، خالید فەرمووی: ئەی مەجاعە، تۆ ئەمڕۆ ئەوەت واز لێهێناوە کە دوێنێ لەسەری بوویت، وە ڕازیبوونت بە بابەتی ئەم درۆزنە و بێدەنگ بوونت لەسەری لەکاتێکدا تۆ سەربەرزترینی خەڵکی یەمامەی، هەروەها تۆ هەواڵی هاتنی منت پێگەیشت، وەك ئیقرارکردن( دانپێدانان) و ڕازیبوون بەوەی کە هێناویەتی**

**جا ئایا نەدەبوو عوزر و بیانوویەك دەربخەیت؟وە قسەت كردبایە لەبارەی ئەو كەسەی كە قسە دەكات؟**

**چونكە لە ثمامة كەسێك قسەی كرد و ئینكاری كرد، هەروەها الیشكری قسەی كرد، جا ئەگەر دەڵێی: لە قەومەكەم دەترسم، ئەی كەوایە بۆچی نەدەهاتی بۆ لای من، یاخود نێردراوێكت بۆ لام بناردایە، فەرمووی: ئەی ابن المغیرة ئایا چیە ئەگەر لە هەموو ئەمەم خۆش ببیت، فەرمووی: لە خوێنت خۆش بووم، بەڵام سەخڵەتی و ناخۆشیەك لەنەفسی مندا هەیە بەهۆی جێهێشتن و وازهێنانت...اهـ**

**وە لەباسی هیجرەت(كۆچكردن) وتەی نەوەكانی شێخ دێنینەوە - كە فەرموویانە - : پیاو ئەگەر لەخاكێكی كوفر بێت وە بتوانێت دینەكەی دەربخات لەلایان، وە بەڕائەتیان لێبكات و لەوەش كە لەسەریدان، وە كوفرەكانیان بۆ دەربخات - باسیان بكات و بۆیان ڕوون بكاتەوە - و هەروەها دوژمنایەتیان بكات، ئەوانیش توشی فیتنە و ناڕەحەتی نەكەن بەهۆی عەشیرەتەكەی یان ماڵ و سامانەكەی، ئەوا حوكم بە كافربوونی نادرێت...تا كۆتایی.**

**مەبەستیش لەمە: پیاو دینی خۆی دەرنەخستووە تا ئەوكاتەی بەڕائەت دەكات لەو كوفرەی كە لەدەورو پشتیاندایە، وە بۆیان ئاشكرا دەكات: كە ئەوان كافرن، وە ئەو دوژمنیانە، جا ئەگەر ئەمە نەبێت ئەوا دەرخستنی دین وەدەست نایەت.**

## بەشێك

## مەسەلەی لاوازکردن( الاستضعاف )

ئەما مەسەلەی پێنجەم: کە بریتیە لە مەسەلەی لاوازی و بێدەسەڵاتی، بەڕاستی زۆرێك لە خەڵك، بەڵکو زۆربەی ئەوانەی کە دەدرێنە پاڵ عیلم و زانست لەم سەردەمانە، لەماناو مەبەستی ویستراوی لاوازکردن(الاستضعاف) هەڵەیان کردووە، وە بەڕاستی الله تعالی لە کتێبەکەیدا ئەمەی ڕوونکردۆتەوە بە ڕوونکردنەوەیەکی شیفاهێن، فەرموویەتی: { وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا } واته: (ئەی ئیماندارن) ئەوە چیتانەو بۆچی ناجەنگن لەپێناوی ڕەزامەندی الله و ڕزگار کردنی لاوازکراوو چەوساوەکان، لەو پیاوان و ئافرەتان و منداڵانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا تۆ ڕزگارمان بکە لەم شارەی کە خەڵکەکەی ستەمکارن و لەلایەن خۆتەوە پشتیوان و یارمەتیدەرێکمان بۆ ساز بکە.

جا الله تعالی وتەی ئەوانی ڕوون کردۆتەوە کە ئەوان بە هەڵبژاردەی خۆیان لەوێدا نیشتەجێ نەبوون، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەوان داوا لە الله دەکەن کە دەریان بخات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پێداگریان لەسەر دەرچوون هەروەها لەسەر ئەوەی کە بیانوویان هەیە و ناتوانن دەربچن.

هەروەها بەڵگەو ئاماژەش بۆ ئەمە بریتیە لە وەسفکردنی خەڵکی شارەکە بە ستەمکار، وە داواکردنیشیان لە پەروەردگاریان تاکو پشتیوان و ڕزگارکەرێك دەستەبەر بکات بۆیان و بیکەن بە دۆست و پشتیوان و سەرکردەی خۆیان، هەروەها سەرخەرێك بنێرێت بۆیان کە بەسەر دوژمنەکانیان سەریان بخات ئەو دوژمنانەی کە لە دەور و پشتی خۆیانن.

هەروەها الله تعالی فەرموویەتی: { إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا } واتە: تەنها ئەو لاواز و بێدەسەڵاتانە نەبن لە پیاو و ئافرەتان و منداڵان ئەوانەی کە ناتوانن هیچ گۆڕانکاریەك ئەنجام بدەن و هیچ ڕێگایەکیش شارەزا نین و پێی نازانن..

جا لەم ئایەتەدا باسی ئەو حاڵەتەی کردووە کە ئەوان لەناویدا بوون ئەویش ئەوەیە کە نەیاندەتوانی هیچ گۆڕانکاریەك ئەنجام بدەن و هیچ ڕێگەچارەیەکیان نەدەزانی.

ابن کثیر فەرموویەتی: وە ناتوانن دەرباز بن لەدەستی موشریکان، وە ئەگەر بتوانن ئەوا نازانن چۆن ڕێگا ببڕن، بۆیەش فەرموویەتی: { لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً }، عکرمة فەرموویەتی: واتە هەڵسان و ڕۆیشتن(نهوض) بەرەو مەدینە، { وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا } موجاهید و عیکریمە فەرموویانە: واتە ڕێگا..اهـ .

جا ئەوەی دەست دەکەوێت لێرەدا ئەوەیە کە لاوازکراوان(المستضعفين) ئەوانەن کە ناتوانن دەربچن لەنێو موشریکان، ئەوان لەگەڵ ئەمەشدا دەڵێن: (رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا).

وە ئەوان لەگەڵ ئەمەشدا هیچ ڕێگایەك پێنازانن، جا هەرکەسێك ئەمە حاڵ و ئەوەش زمانی حاڵی بێت {فَأُولَئِكَ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا} ئا ئەوانە الله تعالی لێیان خۆشدەبێت، بەڕاستی الله هەمیشە لێخۆشبوو و لێبوردەیە.

ئەما ئەگەر بتوانێت بڕواتە دەرەوە لە وڵاتی موشریکان، بەڵام هیچ شتێك قەدەغەی ناکات لە دەرچوون تەنها خۆبەستنەوە نەبێت بە نیشتیمان یان عەشیرەت یان ماڵ و سامان یاخود جگە لەمانەش، ئەوە بەڕاستی الله تعالی بیانووی ئەو کەسەی قبوڵ نەکردووە کە بەم شتانە عوزر بێنێتەوە وە بە ستەمکار لە نەفسی خۆی ناوی بردووە، فەرموویەتی: { إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً }

واتە: بەڕاستی ئەوانەی لە سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەکێشن لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان دەکرد (ئیمان و باوەڕیان لە مەترسیدا بوو کەچی کۆچیان نەدەکرد بۆ نیشتمانی ئیمان، بەتوندیی پیایاندا هەڵدەشاخێن)و دەڵێن: باشە ئێوە لە چیدا بوون و لەکوێ ژیانتان دەبردە سەر؟! لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێ دەسەڵات و لاوازکراو بووین لە زەویدا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی الله فراوان و پان و پۆڕ نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن و (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێک کە ئیمانداران تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن)؟ ئا ئەوانە شوێنەواریان دۆزەخە، کە جێگە و ڕێگە و سەرئەنجامێکی ناخۆش و ناسازو خراپە.

لە تەفسیری (الجلالين) هاتووە: (ظَالِمِى أَنْفُسِهِمْ) ستەمیان لەخۆیان کردووە، واتە: بەهۆی نیشتەجێ بوون و مانەوەیان لەنێوان موشریکان.

هەروها ابن كثير رحمه الله فەرموویەتی: ئەم ئایەت عامە و غستیە بۆ هەرکەسێك کە لەنێو موشریکان نیشتەجێ بوبێت، لەکاتێکدا بتوانێت هیجرەت بکات بەڵام نەتوانێت دینی خۆی بە تەواوی ئەنجام بدات، جا ئەو کەسە حەڕامێکی ئەنجام داوە بە بەڵگەی ئیجماع و بەدەقی ئایەت، کە فەرموویەتی: { إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِى أَنْفُسِهِمْ } ستەمیان لەخۆیان کردووە (بەهۆی وازهێنانیان لەهیجرەت) { قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ } واتە: ئایا بۆچی لێرەدا مانەوە و وازتان لەهیجرەت(کۆچکردن) هێنا، { قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ } واتە: ناتوانین نە لە وڵات بڕۆینە دەرەوە وە نە بڕۆین بەسەر زەوی - بۆ شوێنێکی تر - { قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا } فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی الله فراوان و پان و پۆڕ نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن و (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێک کە ئیمانداران تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن)؟ ئا ئەوانە شوێنەواریان دۆزەخە، کە جێگە و ڕێگە و سەرئەنجامێکی ناخۆش و ناسازو خراپە.

هەروەها ئەبو داود بە فەرموودەیەکی مەرفوع لە سمرة بن جندب ڕیوایەتی کردووە هاتووە: (من جامع المشرك وسكن معه فإنه مثله) واتە: هەرکەسێك لەگەڵ موشریکێکدا نیشتەجێ ببێت و کۆببێتەوە لەگەڵی ئەوا وەکو ئەو وایە(هاوشێوەن و هەمان حیساب دەکرێت بۆیان).

هەروەها السدی فەرموویەتی: ( کاتێك عەبباس و عەقیل و نوفەیل بەدیل گیران، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی بە عەبباس: ( فیدای نەفسی خۆت و دوو کوڕەکەی برات بدە ) وتی: ئەی نێردراوی الله، ئایا نوێژمان بەرەو قیبلەکەی تۆ نەکردووە و هەمان شایەتومانی تۆمان نەوتۆتەوە؟ فەرمووی: ( ئەی عەبباس ئێوە دوژمنایەتیتان کرد بۆیە دوژمنایەتیتان کرا ) ئەینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا)، ابن أبي حاتم ڕیوایەتی کردووە..اهـ

مەبەستیش لەباسکردنی مەسەلەی لاواز کردن(الاستضعاف) ئەوەیە کە لاوازکراو(المستضعف) ناتوانێت هیچ ڕێگەچارە و گۆڕانکاریەك ئەنجام بدات و هیچ ڕێگایەك پێنازانێت، کە ئەو لەگەڵ ئەمەشدا دەڵێت: (رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا) واتە: پەروەردگارا تۆ ڕزگارمان بکە لەم شارەی کە خەڵکەکەی ستەمکارن و لەلایەن خۆتەوە پشتیوان و یارمەتیدەرێکمان بۆ ساز بکە.

وە باسی ئەو کەسەی بیانوو بە نیشتیمان یان عەشیرەت یان ماڵ و سامان دێنێتەوە و لافی ئەوە لێدەدات کە بەو شتە بۆتە کەسێکی لاوازکراو(المستضعف)، ئەوا لە لاف لێدانە درۆی کردووە و بیانووەکەی قبوڵ ناکرێت نە لای الله تعالی وە نە لای پێغەمبەرەکەی، وە نە لای ئەهلی عیلم ئەوانەی کە زانستیان هەیە بە شەریعەتی الله.

## بەشێك

## واجب بوونی هیجرەت(کۆچکردن) و بەردەوام بوونی

ئەما مەسەلەی شەشەم: بریتیە لە واجب بوونی هیجرەت(کۆچکردن) و مانەوە و بەردەوام بوونی، بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم) : (لَا تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ حَتَّى تَنْقَطِعَ التَّوْبَةُ، وَلَا تَنْقَطِعُ التَّوْبَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا)

واتە: کۆچکردن(هیجرەت) نابڕێتەوە تا ئەوکاتەی تەوبە دەبڕێتەوە، تەوبەش نابڕێتەوە تا ئەوکاتەی خۆر لەخۆرئاوادا هەڵدێت.

{ئەحمەد و ئەبو داود ڕیوایەتیان کردووە}

هەروەها أبو يعلى لە الأزهر بن راشد ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی: ئەنەس گێڕایەوە لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی: (لا تستضيئوا بنار المشركين) واتە: ئاگری موشریکان مەکەن بە ڕووناکی بۆ خۆتان، ابن كثير فەرموویەتی: مانای ئەوەیە کە لە ماڵەکانیان نزیك نەبنەوە بە شێوەیەك کە لەگەڵیاندا لە وڵاتی ئەوان بن، بەڵکو لێیان دوور بکەونەوە، وە کۆچ بکەن لە وڵاتەکانیان، هەر لەبەر ئەمەش ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە (لا تتراءى نارهما).

وە لە فەرموودەیەکی تر هاتووە: (من جامع المشرك وسكن معه فإنه مثله) واتە: هەرکەسێك لەگەڵ موشریکێکدا نیشتەجێ ببێت و کۆببێتەوە لەگەڵی ئەوا وەکو ئەو وایە(هاوشێوەن و هەمان حیساب دەکرێت بۆیان).

هەروەها الله تعالى فەرموویەتی: { إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً } واتە: بەڕاستی ئەوانەی لە سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەکێشن لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان دەکرد

(ئیمان و باوەڕیان لە مەترسیدا بوو کەچی کۆچیان نەدەکرد بۆ نیشتمانی ئیمان، بەتوندیی پیایاندا هەڵدەشاخێن)و دەڵێن: باشە ئێوە لە چیدا بوون و لەکوێ ژیانتان دەبردە سەر؟! لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێ دەسەڵات و لاوازکراو بووین لە زەویدا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی الله فراوان و پان و پۆڕ نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن و (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێک کە ئیمانداران تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن)؟ ئا ئەوانە شوێنەواریان دۆزەخە، کە جێگە و ڕێگە و سەرئەنجامێکی ناخۆش و ناسازو خراپە.

هەروەها ابن أبي حاتم لە ابن عباس ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی: (خەڵکانێك لە ئەهلی مەککە موسڵمان بوون،هەروەها ئیسلامی خۆیان دەشاردەوە، موشریکانیش لە ڕۆژی بەدر لەگەڵ خۆیان دەریانخستن، ئەوانیش هەندێکیان بەهۆی پیشەی هەندێکیان توشهاتن، موسڵمانانیش وتیان: ئەوانە هاوەڵی ئێمە بوون و موسڵمان بوون و زۆریان لێکرابوو، بۆیە داوای لێخۆشبوونیان بۆ کردن، ئەوکات ئەم ئایەتە دابەزی: {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ}.

هەروها الضحاك فەرموویەتی: لەسەر کۆمەڵێك مونافیق(دوو ڕوو) دابەزی لە دواکەتبوون لە دەرچوون لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، وە لەگەڵ موشریکان دەرچوون لەڕۆژی بەدر و بەئامانج گیران، ابن کثیر ئەمەی باس کردووە ئینجا فەرموویەتی: ئەم ئایەتە عامە و گشتیە بۆ هەرکەسێك کە لەنێو موشریکان نیشتەجێ بوبێت، لەکاتێکا توانای هیجرەتی هەبێت و نەتوانێت دینەکەی ئەنجام بدات، جا ئەم کەسە بە کۆڕا(ئیجماع) حەڕامی ئەنجام داوە وە بە دەقی ئایەتیش، تا کۆتایی قسەکانی کە لەپێشتردا باسمان کرد.

وە لە وەڵامەکانی آل الشيخ کاتێك پرسیاریان لێکرا: ئایا جائیزە بۆ مرۆڤ گەر بۆ بازرگانی سەردانی وڵاتی موشریکان بکات، یاخود نا؟

وەڵام: ئەگەر بتوانێت دینەکەی دەربخات و دۆستایەتی و موالاتی موشریکان نەکات، ئەوا جائیزە بۆی، چونکە هەندێ لە هاوەڵان وەکو ئەبوبەکر(رضى الله عنهم) سەفەریان کرد و پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) ئینکاری لەمە نەکرد، هەروەك ئەحمەد لە موسنەدەکەی خۆی و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردووە.

**وە ئەگەر نەتوانێت دینەکەی دەربخات و نەشتوانێت دۆستایەتیان نەکات ئەوا ئەمە جائیز نیە سەفەر بکات بۆ وڵاتەکەیان، هەروەك زانایان ئەمەیان باسکردووە، ئەو فەرموودانەش کە باس لە نەهی کردن لەمە دەکەن دەخرێنە سەر هەمان شت**

**چونکە الله تعالی واجبی کردووە لەسەر مرۆڤ کە کردەوە بە تەوحید بکات، هەروەها واجبی کردووە لەسەری کە دوژمنایەتی موشریکان بکات، جا هەر شتێك بکرێتە بیانوو یان هۆکار بۆ پەکخستنی ئەم شتە ئەوا جائیز نیە.**

**بەهەمان شێوە ئەو شتە پەلکێشی دەکات بەرەو موافەقەکردنیان و ڕازیکردنیان، هەروەك چۆن ئەمە واقیعی زۆرێکە لەو موسڵمانە فاسقانەی کە سەردانی وڵاتانی موشریکان دەکەن.**

**مەسەلەی دووەم: ئایا جائیزە بۆ مرۆڤ کە لە وڵاتی کافران نیشتەجێ ببێت لەپێناو بازرگانی لەکاتێکدا دروشمەکانی شیرك تیایدا زاڵ و ئاشکرایە یاخود نا؟**

**وەڵامدانەوەی ئەم مەسەلەیە مەسلەی پێشووتر یەکسانە و وەکو یەکە، جیاوازی نیە لەمەدا لەنێوان وڵاتی شەڕ(دار الحرب) و وڵاتی ڕێککەوتن(دار الصلح)، هەر وڵاتێك تیایدا موسڵمان نەتوانێت دینەکەی دەربخات ئەوا جائیز نیە سەفەر بکات بۆ ئەو وڵاتە.**

**مەسەلەی سێیەم: ئایا جیاوازی دەکرێت لەنێوان مەودایەکی نزیك وەکو مانگێك یان دوو مانگ، هەروەها مەودایەکی دوور و درێژ؟**

**وەڵام: جیاوازی نیە لەنێوان مەودای نزیك و دوور، چونکە هەر وڵاتێك کە نەتوانێت دینەکەی ئاشکرابکات تیایدا و نەتوانێت دۆستایەتی موشریکان نەکات ئەوا جائیز نیە بۆی کە تیایدا نیشتەجێ ببێت ئەگەر بۆ یەك ڕۆژیش بێت، ئەگەر بتوانێت لێی دەربچێت..اهـ**

**له وەڵامێکی تر: ئایا وتەی ئێوە چیە دەربارەی پیاوێك كە هاتبێتە نێو ئەم دینەو خۆشی بوێت و ئەوانەشی خۆش بوێن كە دێنە ناویەوە، وە ڕقی لە شیرك و ئەهلەكەی بێت، بەڵام خەڵكی وڵاتەكەی (یاخود شارەكەی) بەئاشكرا دژایەتی ئەهلی ئیسلام دەكەن و شەڕ لەگەڵ ئەهلەكەی دەكەن، بیانووش بەوە دێنێتەوە كە جێهێشتنی نیشتیمان دەبێتە مایەی سەخڵەتی و ناخۆشی بۆی، جا هیجرەت ناكات و لەوێ كۆچ ناكات بەهۆی ئەم عوزر و بیانووانە، جا ئایا ئەم كەسە موسڵمانە یاخود كافرە؟**

**وەڵام: ئەما ئەو پیاوەی كە تەوحیدی ناسیوە و باوەڕی پێهێناوە و خودی تەوحید و ئەهلی تەوحیدی خۆشبوێت، وە شیركی ناسیبێت و ڕقی لێی بێت و ڕقی لە ئەهلەكەشی بێت، بەڵام خەڵكی وڵاتەكەی - یاخود شارەكەی - لەسەر كوفر و شیرك بن، هەروەها كۆچ نەكات، ئەم بابەتە درێژە و ڕوونكردنەوەی تیایە: ئەگەر بتوانێت دینەكەی دەربخات لەلایان، وە بەڕائەت بكات لەخۆیان و ئەو دینەشی كە لەسەریدان، وە كوفرەكەیان بۆ دەربخات و دوژمنایەتی خۆی ئاسكرا بكات بۆیان، وە توشی فیتنە و نارەحەتی ناكەن بەهۆی عەشیرەتەكەی یاخود ماڵ و سامانەكەی یەن غەیری ئەمانەش، ئەوا حوكم نادرێت بە كافربوونی ئەو كەسە، بەڵام ئەگەر تواناى هیجرەتی هەبێت و هیجرەت نەكات و لەنێو موشریكاندا بمرێت ئەوا دترسین كە بكەوێتە نێو ئەم ئایەتە {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ} جا الله تعالى عوزر و بیانووی هیچ كەسێكی قبوڵ نەكردووە تەنها ئەو كەسە نەبێت كە تواناى هیچی نەبێت هەروەها ئەوەش كە ڕێگا پێ نازانێت - یاخود ڕێگای نەبێت – بەڵام ئەمرۆ زۆر كەمە كە هاوشێوەی ئەمە بوونی هەبێت، بەڵكو بە گشتی و شێوازی زاڵ ئەوەیە كە موشریكان وازی لێ ناهێنن لەنێو خۆیان، بەڵكو یان دەیكوژن یان دەریدەكەن.**

ئەما کەسێك کە هیچ عوزر و بیانوویەکی نەبێت بۆ وازهێنان لە هیجرەت وە لەنێویاندا نیشتەجێ ببێت و وایان بۆ دەربخات کە لەوانە و دینی ئەوان حەقە و دینی ئیسلام دینێکی ناحەق و باطلە، ئەو کەسە کافر و مورتەدە ئەگەرچی بە دڵیش دینی ناسیبێت، چونکە خۆشەویستی دونیا بەسەر دواڕۆژ قەدەغەی کردووە لە هیجرەت، وە قسە بکات بەقسەی کوفر بەبێ ئەوەی زۆرلێکراو بێت، جا دەچێتە نێو وتەی الله تعالى کە فەرموویەتی: {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ} تاکۆتایی ئایەتەکان.

ئەمە لە وەڵامی شێخ حوسێن و شێخ عبد الله ـی کوڕی محمد کوڕی عبد الوهاب بوون الله تعالى ڕەحمیان پێبکات و لێیان خۆشبێت.

وە کاتێك پرسیاریان لێکرا دەربارەی خەڵکی شارێك کە ئەم بانگەوازەیان پێ گەیشتبێت و هەندێکیان دەڵێن: ئەم بابەتە حەقە، وە هیچ خراپەیەکی نەگۆڕیوە و فەرمانی بەهیچ چاکەیەك نەکردووە، وە ئینکاری لە موەحیدان بکات کاتێك دەڵێن: بەڕائەتمان کرد لە دینی باب و باپیران، وە ئەو کەسەی کە دەڵێت: ئەمە شتێکی جوانە، ناتوانێت بەئاشکرا بیڵێت.

لە وەڵامدا فەرموویان: خەڵکی ئەم شارە ئەگەر ئەو حوججەیە چەسپابێت بەسەریاندا کە بەهۆیەوە کەسی پێچەوانەکار کافر دەبێتەوە ئەوا حوکمەکەیان حوکمی کافرانە، وە ئەو موسڵمانەی کەلەنێویاندا دەژییێت و ناتوانێت دینی خۆی دەربخات ئەوا لەسەری واجبە کە هیجرەت بکات، ئەگەر لەو کەسانە نەبێت کە الله تعالى عوزری قبوڵ کردوون، جا ئەگەر هیجرەت(کۆچ) نەکات ئەوا حوکمەکەی هەمان حوکمی ئەوانە لەکوشتن و بردنی ماڵ و سامان..اهـ

جا لەم وەڵامانەدا چەند مەسەلەیەك هەن، لەوانەش: باسکردنی کەسی لاوازکراو(المستضعف) کە نە توانای ئەنجامدانی هیچ شتێکی هەیە و نە هیچ ڕێگایەك پێدەزانێت، هەروەك لەپێشتردا باسکرا.

**هەروەها: ئەگەر موسڵمان نەیتوانی دینەکەی ئاشکرا بکات ئەوا واجبە لەسەری کە هیجرەت بکات، ئەمەش بەهەمان شێوە لەپێشتر باسکرا.**

**هەروەها: سیفەت و چۆنیەتی دەرخستنی دین، کە بریتیە لە باسکردنی کوفری کافران بەئاشکراو دوژمنایەتی کردنیان و ئەو دینەش کە لەسەریدان، بەهەمان شێوە لەپێشتر باسکرا.**

**وە هەروەها: باسکردنی ئەوەی کە ئەگەر ئەو شتەی کرد، مەبەستم ئاشکراکردنی کوفرەکەیان و دوژمنایەتی کردنیان ئەوا بەو شێوەیە لەنێو خۆیان وازی لێناهێنن، بەڵکو یان دەیکوژن یان دەریدەکەن.**

**گوتم: وە بەڕاستی الله تعالى هەواڵی داوە بەم شتە دەربارەی هەموو کافران، فەرموویەتی: {وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ (13) وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِهِمْ ذَلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ}**

**واتە: ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون بە پێغەمبەرانی خۆیانیان وت: (ئەگەر کۆڵ نەدەن) بەڕاستی لە وڵاتمان دەرتان دەکەین، یان دەبێت بێنەوە ڕیزی ئاینەکەی ئێمە، ئەوسا پەروەردگاریان پەیامی بۆ ناردن کە: دڵنیابن ئێمە ستەمکاران (بەم زووانە) لەناو دەبەین و دەیانفەوتێنین.**

**بێگومان نیشتەجێتان دەکەین لەو وڵاتەدا لە دوای ئەوان، ئەوەش بۆ هەموو ئەو کەسانەیە کە لە وەستانیان لە بەردەم دەسەڵاتی مندا دەترسن و هەڕەشەکانی من بیم و ترسیان هەیە.**

**هەروەها الله تعالى لە هەواڵدانی دەربارەی قەومی شوعەیب فەرموویەتی: {قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لَنُخْرِجَنَّكَ يَاشُعَيْبُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَكَ مِنْ قَرْيَتِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَارِهِينَ}.**

**واتە: دەستەی دەسەڵاتداران، ئەوانەی لووت بەرزیان کرد لە قەومەکەی وتیان: ئەی شوعەیب سوێندبێ خۆت و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لە گەڵتدا لە شارەکەماندا دەرتان دەکەین، یان بە ئارەزووی خۆتان بگەڕێنەوە نێو ئاینەکەمان، ئیمانداران وتیان: ئایا ئەگەر حەزیشی لێ نەکەین بەدڵیشمان نەبێت؟!**

**هەروەها الله تعالى لە هەواڵدانی سەبارەت بە هاوەڵانی ئەشکەوت(أصحاب الكهف) فەرموویەتی: {إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا}**

**واتە: چونکە بەڕاستی ئەو بت پەرستانە ئەگەر پێتان بزانن، ئەوە بەرد بارانتان دەکەن، یان دەتانگێڕنەوە بۆ ناو ئایینی خۆیان، ئەو کاتە ئیتر هەرگیز سەرفراز نابن.**

**هەروەها وتەکەی { يَرْجُمُوكُمْ} واتە: دەتانکوژن بە بەردبارانکردن.**

**هەر ئەمەشە کە الله تعالى هەواڵی داوە دەربارەی، هەروەها زانایانی ئیسلام ئاماژەیان پێداوە کە لەم سەردەمانەی ئێستادا بوونی هەیە و شتێکی واقیعیە، چونکە مورتەدان بەهۆی دۆستایەتی کردنی موشریکان و چوونە نێو گوێڕایەڵیان، ڕازی نابن مەگەر بە کەسێك نەبێت کە موافەقەیان بکات لەسەر ئەم شتە، وە ئەگەر ئینکاریان لێبکات بەهۆی ئەنجامدانی خراپەیەك ئەوا ئازاری دەدەن بە خراپترین ئازار، وە لەنێو خۆیاندا دەریدەکەن، بەڵکو هەوڵی کوشتنی دەدەن ئەگەر ڕێگایەك بۆ ئەمە بدۆزنەوە..والله المستعان**

# قسەکانی شێخ تەواو بوون

# والحمد لله رب العالمين

# پێڕستی بابەتەکان